



# چۆن پاکیزەیی چاوم بپارێزم

محمد یوسف گوڤەن



İRFAN
PUBLISHING

# پێرستی بابەتەکان

## بەشی سێیەم

## چۆن چاوەکانم لە حەرام دەپارێزم؟



## بەشی چوارەم

## حوکمەکانی تەماشاکردنی حەرام

## لە ئایینەکەماندا بریتین لە چی؟

# پێشەکی



ڕوانین بۆ حەرام و بابەتی پاکیزەیی (عیففەت) ئەو بابەتە گرنگەیە کە تێیدا هەموو ئیماندارێك و بە تایبەتیش گەنجان ڕووبەڕووی تاقیکردنەوە دەبنەوە. دیارە نەبوونی کتێبێکی تایبەت بەم بابەتە، ئێمەی خستە دوودڵییەوە. بەڵام فەرمانی "تۆ تەنها تەبلیغی بکە!" ی خوای گەورە و پێداگریی هاوڕێیانمان وای کرد ئامادەکردنی کتێبێکی دەستی لەم بارەیەوە ببێتە ئەرکێك.

هەموو ئەو گەردیلانەی لە زەوی و ئاسمانەکاندان، هەریەکەیان بۆ خاوەنە ڕاستەقینەکانی بینایی دەبنە کۆمەڵێك بەڵگە کە بوونی یەزدان ڕادەگەیەنن و یەکتایی ئەو دەچڕن و فەرمانبەرداریی دەکەن و سوپاسگوزاریی بۆ دەردەبڕن و یادی دەکەنەوە و کڕنووشی بۆ دەبەن. دیارە سەرجەمی بوون بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی دروستکراوە. وەك چۆن بەخششی بینایی بۆ ئەوە دراوەتە مرۆڤ تا لە دونیای بوون بڕوانێت و پەندی لێ وەربگرێت، بەخششی گوێچکەکان و بیستنیشی بۆ ئەوە پێدراون تا دانایییەکانی سەر زەوی و ئەو ئایەتانەی پێ ببیستێت کە جەنابی حەق نیشان دەدەن و سوودیان لێ ببینێت. بەخششی دڵیش بۆ ئەوە ئەمانەتی مرۆڤ کراوە تا ببێتە خاوەنی زانست و

فیكر. لەم كاتەدا ئەركی سەرشانمانە ئەم بەخشایشانە بە ئاڕاستەی ئامانجی بەخشینیان بەكاربهێنین. چونكە پەروەردگارمان بەم جۆرە لەمە ئاگادارمان دەكاتەوە "مەكەوەرە شوێن ئەو شتەی كە نایزانیت! چونكە ئەندامەكانی جەستە وەك گوێچكە و چاو و دڵ هەموویان دەخرێنە بەردەم لێپرسینەوە." (الإسراء: ٣٦)

شوكرانەبژێریی گوێیەكان بەوە دەبێت گوێ بۆ قورئانی پیرۆز ڕادێرین و وانە لە ئایەتەكانی وەربگرین و بپارێزین لە غەیبەت و قسەی پاشەملە و، دووری بخەینەوە لە بوختان و سەرجەم ئەو خراپانەی كە خوای گەورە قەدەغەی كردوون. شوكرانەبژێریی بینایی و چاوەكانیش بەوە دەبێت لە ئایەتەكانی گەردوون بڕوانین، بە جۆرێك پەندیان لێ وەربگرین و لە هەمان كاتدا بیانپارێزین لە ڕوانین بۆ ئەو شتانەی خوای گەورە ڕوانینی قەدەغە كردوون. تەماشاكردنی خۆر و مانگ و ئەستێرەكان و دەریا و وشكانی و دار و میوە و چیا و بەرد و كانی و دەشت و شەو و ڕۆژ و تاریكی و ڕووناكی و ئاسمان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە و، تێگەیشتن لە گەورەیی پەروەردگار و، بینینی ئەمانە كە چۆن بە زاری خۆیان تەسبیحاتی پەروەردگاریان دەكەن و بوون و یەكتایی ئەو بەیان دەكەن و، درككردن بەوەی كە سەرجەمی ئەمانە خراونەتە ژێر فەرمانی مرۆڤەكانەوە و، بیركردنەوە لە شێوەی دروستكردنیان... هۆكاری بەخشینی چاوە بە مرۆڤ. پەروەردگارمان ئەمەمان بەم جۆرە بۆ ڕوون دەكاتەوە:

"ئەو بێباوەڕانە تەماشا ناكەن و بیر ناكەنەوە: (بۆ نمونە) وشتر چۆن دروستكراوە؟ ئاسمان چۆن بنیاتنراوە و بەبێ كۆڵەكە بەرزكراوەتەوە؟ چیاكان

چۆن زەوییان گرتووە و وەك تەوەرەی هاوسەنگی چەقێنراون. چۆن ڕووی زەوی ڕاخراوە و وای لێکراوە بۆ ژیان دەست بدات؟" (الغاشية: ١٧-٢٠)

"بیر بکەنەوە و پەند وەربگرن ئەی خاوەن بیناییەکان!" (الحشر: ٢)

"ئێستا بیر بکەنەوە لەو مەنییەی لێتان دەردەچێت! ئایا ئەوە ئێوەن کە دروستی دەکەن و دەیکەنە مرۆڤ، یان ئێمەین ؟" (الواقعة: ٥٨- ٥٩)

"بڕواننە ئەو تۆوەی کە دەیچێنن! ئایا ئێوە پەروەردەی دەکەن یان ئێمە؟" (الواقعة: ٦٣–٦٤)

"ئەدی چی دەڵێن بۆ ئەو ئاوەی کە دەیخۆنەوە؟ ئایا خۆتان لە هەورەوە هێناتانە خوار، یان ئێمە؟" (الواقعة: ٦٨-٦٩)

"ئەی چی دەڵێن بۆ ئەو ئاگرەی کە دەیکەنەوە؟ ئایا خۆتان دارەکەیتان دروستکرد، یان دروستکەری ئەوە ئێمەین؟" (الواقعة: ٧١-٧٢)

پێویستە بەباشی بیر لە چاو بکەینەوە. گەر توێژاڵێك لەو حەوت توێژاڵەی چاوی لێ دروستکراوە کێشەی بۆ دروست ببێت، ئەم بەخششە دەپوکێتەوە. تۆ بڵێیت لە دونیادا کەسێك هەبێت ئامادە بێت یەك چاوی خۆی بگۆڕێتەوە بە هەموو دونیا و سامانی نەبڕاوەی؟ چاو ئەو ئەندامەیە کە تەنانەت وای لە داروینیش کرد بڵێت "کە بیر لە چاو دەکەمەوە بێتاقەت دەبم!"، پەنجەرەی کرانەوەی ڕۆحە بە ڕووی دەرەوەدا، گەر چاو دروستکراوێکی بزوێنەری دەراسای شەیدایی نەبێت، دەبێت چی بێت؟

کاتێك مویتەلای نارەحەتییەك دەبین بەهۆی چاوەکانمانەوە و پزیشکەکەمان دەڵێت "لەمەودوا بە هیچ جۆرێك تەماشای خۆر مەکە!" یان "فلانە خواردن

مەخۆ" و لەگەڵ ئەمەشدا دەڵێت "ئەگەرنا بینایت لەدەست دەدەیت"، ئێمە لە بەرامبەر ئەم ڕێنماییەدا چی دەکەین؟ بێگومان لە ئەنجامی ئەو ترسەی لەدەستدانی چاوەکانمان پێمان دەدات، هەوڵ دەدەین پیت بە پیت ڕێنماییەکانی پزیشکەکەمان جێبەجێ بکەین. وا نییە؟ با ئێستا تێ بفکرین. گەر ئەو کەسەی ڕوانینمان بۆ ئەو دیمەنانە قەدەغە دەکات کە کار لە ڕۆح و ئایین و پەیوەندیمان لەگەڵ خوادا دەکات، پزیشکێك نەبێت و پەروەردگارمان بێت، ئەو کاتە دەبێت چی بکەین؟ با بیر بکەینەوە و لە لایەنێکەوە بە دوای ڕێگاکانی نوقوم نەبووندا بگەڕێین و هەوڵ بدەین بیاندۆزینەوە.

گەر ئەم کارەی بەردەستمان بتوانێت لەم ڕێیەدا هاوکاری ئێوە و ئێمە و بە تایبەتیش برا گەنجەکانمان بێت، خۆمان بە بەختەوەر دەزانین.

لە ئێمەوە هەوڵ و پەرۆشی و لە بەخشندە و میهرەبانترینیشەوە سەرکەوتن.

محمد یوسف گوڤەن

١٠ی ئەیلولی ٢٠٠٩

# بۆچی ناتوانم چاوەکانم لە حەرام بگێڕمەوە؟



## بەلای "خۆ چی دەبێت"

”خوا بە نیەتی شاراوەی ڕوانینەکان
و نهێنیی نێو دڵ زانایە“

(غافر: ٤٠/١٩)

زۆر شت ڕوودەدات.

زۆر شتیش ڕوویاندا.

زۆر شت هەن، لەمێژە کۆتاییان هات و، نەمان.

هەر وەك ئەو مێردمندالەی پێش سوتاندنی کۆشکێکی مەزن شقارتەکە دەگرێت بە دەستییەوە و دەلێت ”خۆ چی دەبێت“، لە ئەنجامی ڕەفتارە بە کەم زانراوەکان دەبێت چەند ژیان هەبن لەمێژە سوتابن و، لەناوچوونن و بووبێتن بە خەلوز.

هەموو مرۆڤێك وەك تەلارێکی کریستالی وەهایە. بەنرخە، بەلام تەلارێکی ناسکە... دەستەواژەی "خۆ چی دەبێت!" یش گەورەترین دوژمنیەتی. ڕەنگە

بە گوفتارێکی وەك "خۆ چی دەبێت" کە لە ڕووکەشدا بە ئاسان دەبینرێت، وەك ئەوەی بە دەنکە شقارتەیەك خەرمانی یەك ساڵ بسوتێنێت و خۆی لە خەرمانی هەموو ژیانی بێبەش بکات.

با بیرێك بکەینەوە، ئایا هەرگیز دەربارەی تەندروستی جەستەمان وتومانە ''چی دەبێت، میکرۆبێکی بچوك یان ڤایرۆسێك چی لە من دەکات؟'' لەکاتێکدا زۆر باش دەزانین، میکرۆب و ڤایرۆسی وا هەیە، هەر کە تێکەڵی خوێنمان بوو و لە جەستەماندا جێگیربوو، ڕزگاربوونمان مەحاڵ دەبێت.

زۆر میکرۆب و ڤایرۆس هەن کە ناویان لەگەڵ مردندا دەبرێت. کاریگەرترین ڕێگەی جەنگ لەگەڵ ئەم جۆرە میکرۆب و ڤایرۆسە کوشندانەشدا، بێگومان ڕێگریکردنە لە هاتنەناوەوەیان بۆ ناو جەستەمان. تەنانەت لەپێناو پاراستنی تەندروستیماندا، گرنگترین بنچینە بریتییە لەوەی تا پێمان دەکرێت خۆمان بەدوور بگرین لەو شوێنانەی ئەگەری بوونی ئەم جۆرە ڤایرۆسانەیان لێ دەکرێت.

ئەی ئایا ئەو ڤایرۆسانە دەناسین کە ئیفلیجکەر و کوشندەن بۆ ژیانی مەعنەوی و دڵ و ڕۆح و تەنانەت نەفسمان؟ تا چەندێك بەرامبەر ئەو ڤایرۆسانە هەستیارین کە دڵمان تاریك دەکەن و، ڕۆحمان دەپووکێننەوە؟ کاتێك جەستەمان ڕووبەڕووی نەخۆشییەك دەبێتەوە، گەر ڕێگە خۆش بکرێت بۆ ئەو بارودۆخانەی چارەسەری نەخۆشییەکە سەختتر دەکەن، بچوکترین هەڵامەت دەبێتە ئەنفلۆنزا و ئەنفلۆنزاش دەبێتە هەوکردنی سییەکان و ئەویش دواجار بەرەو مردن دەیداتە بەر، بە هەمان شێوە ئەو گوناهانەی بە بچوك دەیانبینین و، تەوبەیان لەسەر ناکەین و لەپاش ئەنجامدانیان ناچینە سەر ڕێی خاوێنبوونەوە، ڕەنگە لایەنی مەعنەویمان تێك بشکێنن و بەرەو هەڵدێرمان ببەن.

دەوترێت گەر تەوبەی ڕاستەقینە بکرێت، گوناهە گەورەکان بە گەورەیی نامێننەوە و، گەر تەوبەش نەکرێت گوناهە بچوکەکان بە بچوك هەژمار ناکرێن. چونکە وەك چۆن لە هەموو نەخۆشییەکەوە ڕێگایەك بەرەو مەرگ هەیە، لە هەموو گوناهێکیشەوە ڕێگایەك بەرەو کوفر بوونی هەیە. مرۆڤ کاتێك ئەو گوناهە ئەنجام دەدات کە ناتوانێت لە نێو کۆمەڵگەدا ئەنجامی بدات، لەبەر ئەو ناڕەحەتییەی کاتێك کەسانی تر گوناهەکەی دەبینن تووشی دەبێت (گەر تەوبە لەو گوناهەی نەکات) ڕەنگە بیەوێت بڕوا بەوە بکات کە چاودێریی فریشتەکانی بەسەرەوە نییە و نایبینن. ڕەنگە تاوەکو ئینکاریکردنی پایەیەکی وەها لە ئیمان بڕوات کە یەکێکە لە مەرجەکانی باوەڕداربوون. وەك ئەوەی لە ترسی مێشولە ڕابکات و، دواتر بکەوێتە بەر گەستنی ڕەشمار، بە جۆرێك لە ئەنجامی پێداگری لەسەر گوناهێکی بچوك (خوا بمانپارێزێت) دەرگای بێ ئیمانی بە ڕوودا والا دەکرێت.

ئەو کەسەی کە گوناه دەکات حەز بەوە دەکات کە ڕۆژی دواییش بوونی نەبێت. ڕەنگە ئەمە زۆر زیاتریش بڕوات و پڕبەدڵ ئاواتەخوازی ئەوە بێت کە خوایەك نەبێت بەردەوام چاودێریی بکات. لەبەر ئەوەی هەتا لەسەر گوناهەکە بەردەوام بێت، بە لایەوە سەختە ببیستێت ئەوەی دەیکات گوناهە، دەست دەکات بەوەی حەرام بە حەرام نەزانێت. دەکەوێتە ئینکاریکردنی ئەو فەرمانەی کە حەرامی کردووە و، دەچێتە سەر ڕێگەیەکی تا بڵێیت مەترسیدار. وەك دەبینرێت تەنها گوناهێك گەر تەوبەی لەسەر نەکرێت و بەخێرایی خاوێن نەکرێتەوە چەندین ڕێگەی بەرەو کوفر لێ دەبێتەوە.

لەڕاستیدا شەیتانیش هەر بۆ ئەم ئامانجە گوناهەکەی پێ ئەنجام دەدات. دەرگای تەوبەی بە داخراوی نیشان دەدات و لەپێشدا ئەنجامنەدانی پەرستش

و دواتريش ڕێگا بۆ ئينكاريكردن خۆش دەكات. گەر نا بە تەوبەكردن و پەشيمانبوونەوە، كاتێك ڕوومان بەرەو خواى پەروەردگار وەردەچەرخێنينەوە، لاى شەيتان وەك ئەوەى لێ دێت پاش تۆماركردنى يەك گۆڵ بردنەوەى يارييەكە بە سێ گۆڵ بۆ ئێمە بێت. شەيتانيش لێرەدا هيچى دەست ناكەوێت.

لێرەدا نابێت ئەوەمان لە ياد بچێت كە ڕەحمەتى پەروەردگارى مەزن زەرياييەكى بێبنە. هەموو گوناهێك (بە مەرجى ئەوەى سەر نەكێشێت بۆ سەرەڕۆيى) گەر هەزار جاريش ئەنجام بدرێت لەو زەريايەدا خاوێن دەبێتەوە. حاشا ڕەحمەت جامێك ئاو نييە تا بە خاوێنكردنەوەى يەك جارى ئێمە گەرد بگرێت. بەڵام كاتێك كەسێك گوناهێك دەكات شەيتان دەچێت لە جياتى سى و نۆ دەرگاى ڕەحمەتى كراوەى تەلارەكە، ئەو تاكە دەرگايەى نيشان دەدات كە وا دەردەكەوێت داخراو بێت و پێى دەڵێت لێرەوە دەرچوون نييە. بەم جۆرە هەوڵ دەدات لەم ڕێگەى دارمانەدا هاوڕێيەكى زياتر بۆ خۆى پەيدا بكات. بەداخەوە مرۆڤيش لێرەدا زۆر جار هەڵدەخەڵەتێت.

باشە، چارەسەر چييە؟

* سەرەتا نابێت هيچ گوناهێك بە بچوك تەماشا بكەين و، هەرگيز نەڵێين "خۆ چى دەبێت."

* بەو جۆرە هەڵسوكەوت بكەين وەك ئەوەى لە كێڵگەيەكى ميندا بين.

ئاگادار بين و "لە ڕوانينێك، دەست ليدانێك، ماچێك ياخود تامكردنێك"دا نوقوم نەبين.

*گەر گوناهەكە بەنابەدڵيش ئەنجامدرا، يەكسەر تەوبەى لەسەر بكرێت و، بەردەوامى پێ نەدرێت، گەر بەردەواميش بوو، بێئومێد نەبێت.

* بۆ چارەسەری برینەکانی بەزوویی ڕوو بکاتە دەرگانەی پەروەردگار کە هیچ هاوتایەکی تری نییە و بەردەوام لە چاودێریی گەڕانەوەی بەندەکانیدایە. پەنا بۆ ڕەحمەتی ببات و پێغەمبەری ئازیزیش بکاتە شەفاعەتکار بۆ بەدەستهێنانی شەفەقەتی ئەو.

* ئاگادار بێت تا هەمان هەڵە دووبارە نەکاتەوە و، تا دەتوانێت لە گوناهـ دوور بکەوێتەوە و ئەو ڕێگایانە دابخات کە دەچنەوە سەر گوناهـ.

* نەك بە تەنها گوناهـ نەکردن، بەڵکو بڕیار بدات جارێکی تر هەنگاویش هەڵنەنێتە سەر ئەو ڕێگایانەی کە دەچنەوە سەر ئەو گوناهە.

باشە، چۆن دەتوانین ئەمانە ئەنجام بدەین، با ئینشائەڵلا هەموو پێکەوە ئەمە لە بەشی سێهەمدا ببینین...

## ئالودەیی تەماشاکردن

جەریری کوڕی عەبدوڵلا (رضيَ اللهُ عَنهُ) دەفەرمووێت "حوکمی بینینی لەناکاوم لە پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) پرسی، فەرموویان "یەکسەر چاوت لا بە."[1]

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین کە ڕوانینی حەرام ئالودەییە. گەر لەگەڵ کەسێکی جگەرەکێشدا بدوێیت، پێت دەڵێت کە بە ئارەزوو و زانین و ویستی خۆی جگەرە دەکێشێت. بەڵام کاتێك لە ڕەمەزاندا دەبینین کاتی بەربانگ کابرا لەپێش ئاویشدا دەست بۆ جگەرەکەی دەبات، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەمە وا نییە. چونکە بابای جگەرەکێش لە زووەوە ئیرادەی بەرامبەر ئەو نەفرەتییە لەدەستداوە.

---

1. أبو داود، النكاح ٤٣؛ أحمد بن حنبل، مسند ٣٦١/٤؛ داري، سنن ٣٦١/٢.

جا گەر ئەمە ماددەی زۆر کاریگەرتری وەك ماددە کحولییەکان یاخود بێهۆشکەرەکان بێت، مانای ئەوە دەبێت کە ئیرادەی بابای بەکارهێنەر بە تەواوی ئیفلیج بووە. چونکە ئەستەمە کەسێکی ئالودەی ماددە کحولییەکان لە شوێنێك بێت کە ئەو ماددانەی لێیە و ئەم بەکاریان نەهێنێت. مەستییە بە ڕواڵەت چێژبەخشەکانی یەکەم جار لەمێژە بەسەرچوون و بەکارهێنەر لەمێژە بووەتە هەڵگری پەسنی "ئالودەبوو".

بۆچی ئەمانە باس دەکەین. چونکە سەرجەم حەرامەکان تایبەتمەندیی هاوشێوەیان هەڵگرتووە. ئەو مرۆڤەی قسەی پاشەملە و غەیبەتی زۆر دەکات، ڕەنگە خۆی هەستی پێ نەکات بەڵام وای لێ دێت گەر قسەی بەرز و نزم لە بارەی ژیانی خەڵکییەوە نەکات، دەتەقێت. بۆیە ئەو ئالودەبووی خواردنی گۆشتی مردووە. هەر وەك چۆن ئەو کەسەی قومار دەکات یان ئالودەی قوماری پێشبڕکێی ئەسپسوارییە، پێیەکانی لەخۆوە بەرەو قومارخانە هەنگاو هەڵدەنێن. دیارە هەموو ئەمانە ئەو ڕاستییە تاڵانەن کە لە سەرەتادا خۆیان دەرناخەن، بەڵام لەپاش خاڵێکی دیاریکراو گەڕانەوە لێیان زۆر سەخت دەبێت.

تەماشاکردنی حەرامیش بەبێ هیچ گومانێك هەر بەم شێوەیەیە. کاتێك ئەو یەکەم سووربوونەوە بە ڕواڵەت بێتاوانانەی ڕوخسار لە کاتی ڕوانیندا وەك دڕانی پەردەیەك کاریگەریی خۆی لەدەست دەدات، ئیدی وای لێ دێت وردە وردە دەنگە ورياکەرەوەکانی ویژدانی مرۆڤ نابیسترێن. لە ئەنجامدا وای لێدێت گەر لە بەرامبەر تەماشا نەکردنی حەرامدا دیاریی گەورەش بخەنە بەردەم مرۆڤی موبتەلای ڕوانینی حەرام، ڕەنگە نەتوانن لەو ئالوودەبییە بیگێڕنەوە. چونکە لەمێژە لێواری مەترسیدار تێپەڕێنراوە.

دەتوانن ئەمە بچوێنن بە دەرچوونی ئێسقانی مەچەك، دەبینین کاتێك یەك جار لەجێ دەچێت، ئاسان دەچێتەوە شوێنی خۆی، بەڵام کە دووەم جار و لە هەمان جێگاوە لەجێ دەچێت، خۆگرتنەوەی سەختتر دەبێت. لەجێچوونەکانی جاری سێیەم و چوارەم و پێنجەم تووشی داخورانێکی وەهای لێ دەکات کە لە کەمترین فشارخستنەسەریدا لەجێی خۆی دەربچێتەوە.

دەکرێت بۆ چاویش ئەمانە بڵێین. زۆر سەختە بتوانرێت چاوێکی ڕاهاتوو بگیرێتەوە لە ڕوانینی حەرام . ئەوەی تەماشا دەکات هەستی پێ ناکات بەڵام ئیدی ئەو ئالودەی تەماشاکردنی حەرامە. هەردەم لە ئارەزووی ئەوەدایە ڕاستەوخۆ یان بەدزییەوە تەماشای هەر ڕەگەزێکی بەرامبەر بکات کە لە لایەوە تێ بپەڕێت. گەر چاویشی لا ببات، بە لاچاو تەماشای لایەك هەر دەکات. چونکە گەر چاوی دڵی بەتەواوی کوێریش نەبووبێت، لەمێژە تووشی خێلی هاتووە.

بێگومان لەم ئالودەییەشدا چەندین پلە هەیە. وەك چۆن ئەوەی لە ڕۆژێکدا دوو سێ جگەرە دەکێشێت لەگەڵ ئەوەدا نابێتە یەك کە دوو سێ پاکەت دەکێشێت، لە نێوان موبتەلایانی ڕوانینی حەرامیشدا جیاوازی هەیە. بەڵام سەرجەمی ئەم موبتەلایانە لەژێر کاریگەرییەکی تاڵدان کە هەموو ڕۆژێك دونیاکەیان تاریکتر دەکات.

ڕەنگە غەمگینترینیان دۆخی ئەو کەسانە بێت کە نایانەوێت بڕوانن ،بەڵام ناتوانن. دۆخی ئەوانەش کە پێگەی کۆمەڵایەتییان داخوازی ئەوەیە تەماشای حەرام بکەن وەك حاڵی ئەوانە وایە کە خۆیان جگەرە ناکێشن بەڵام هەمیشە دوکەڵی جگەرەیان بەسەردا دەچێت.

گەر کردەوەکان بەپێی نیەتیش بێت هێشتا ناکرێت ئەوە بوترێت کە ناکەونە ژێر کاریگەرییەوە. چی بڵێین لە دوارۆژدا.

بەڵام لەچاو جگەرەدا خراپترین شت بۆ ئەمرۆ کە بیچوێنین بە خواردنەوەی مەی و مادده بێهۆشکەرەکان، ئالودەیی بڵاوکراوە بەدڕەوشتییەکانە. ئەمانە ئەو ئالودەییانەن کە لە ڕوانگەی ژیانی مەعنەوییەوە زۆر کوشندەتر و ڕزگاربوونیش لێیان زۆر سەختترە. ئەوانەی لە تەمەنی منداڵی و گەنجێتیدا ڕووبەڕووی ئەم بڵاوکراوانە دەبنەوە، بەدڵنیاییەوە دەکەونە ژێر کاریگەرییەکی تا بڵێیت قووڵ و ڕوخێنەرەوە.

دەبێت دۆخی ئەو داماوە چۆن بێت کە لە تەمەنێکی کەمدا یان تەنانەت لە سکی دایکیدا تووشی دەبێت بە تووشی خواردنەوەی کحولییەوە و ئەگەری ئەوەی هەیە ببێتە ئالودەی خواردنەوە کحولییەکان، حاڵی ئەو عەقڵ و دڵەش بە هەمان جۆرە کە لە تەمەنی منداڵی و گەنجێتیدا گیرۆدەی دیمەنە بەدڕەوشتییەکان دەبێت. دیارە چاوەڕێی ئەوە ناکرێت ئەم کەسە کە گەورە بوو وابەستەییەکەی نەمێنێت، بە هەمان شێوە ڕەنگە ئەستەمیش بێت درك بەو وابەستەییە بکات.

پێویستە شێوازی چارەسەری کاریگەر بۆ چاکبوونەوەی ئەو مرۆڤانە بدۆزرێتەوە کە ناتوانن بەبێ تەماشاکردن هەڵ بکەن. چونکە ئالودەییەك لەم ئاستەدا زیاتر بە شکانی مەچەك دەچوێنرێت وەك لە لەجێچوونی. وەك چۆن ئێسکێك بەردەوام و چەندبارە لە هەمان شوێنەوە بشکێت و ورد ببێت، ئەمڕۆ چەندین گەنجی سافدەماخ لەژێر چەکوشی دونیای بەدڕەوشتی و لادانی زایەندی دەپلیشێنەوە.

وەك دەزانین بۆ چارەسەر، لە پێشدا پێویستە کەسی ئالودە ئالودەییەکەی خۆی قەبووڵ بکات و دەرك بەوە بکات کە پێویستی بە چارەسەرە و دڵی پێوەی بێت. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم نەخۆشییە لە ئاستی ئالودەییدایە، چیتر ناتوانرێت لە ڕێگەی میکانیزمەکانی کۆنترۆڵی "خود"ەوە چارەسەر بکرێت. کەسی ئالودە چەندە ویستیشی لەسەر بەرەنگاربوونەوەی گوناهەکە هەبێت، ئەستەمە بتوانێت بەتەنها لەژێر ئەم بارەدا هەستێت. لەبەر ئەمە لە دەرەوەی کۆنترۆڵی خود، پێویستی بە میکانیزمەکانی کۆنترۆڵی دەورووبەر دەبێت.

سەرەتا مەرجە ئەو کەسە گۆڕانکاری لە ژینگەکەیدا بکات. وەك چۆن مەرجی یەکەم بۆ ئەو کەسەی کە واز لە خواردنەوە کحولییەکان دەهێنێت، بریتییە لە دوورکەوتنەوە لەو ژینگانەی کە خواردنەوەی کحولییان لێیە، ئەو کەسانەش کە لەژێر کاریگەریی ئەم جۆرە ئالوودەییەدان، لەگەڵ پێویستیی ویستنی خۆیاندا، (لە بەشەکانی داهاتوودا هەوڵ دەدەین بە شێوازێکی بەرفراوانتر ئەم بابەتانە ڕوون بکەینەوە)، پێویستی بە جێبەجێکردنی ئەم مەرجە بنەڕەتییانە هەیە:

* ڕامالینی ژینگەکە لە دیمەنە حەرامەکان.

* بەتاڵنەبوون.

* سەرقاڵبوون بە شتە بەسوودە دونیایی و دوارۆژییەکانەوە.

* بەردەوام پێکەوەبوون لەگەڵ مرۆڤە چاکەکاندا.

* هەستیاربوون لەمەڕ فەرزەکان.

* پەنابردنە بەر وەرگرتنی بیروڕای حەکیمەکانی مەعنەویات.

* گەر عیللەتەكە لە ئاستی ئالودەییدا بوو، پێویستە ئیستیغفاری و سەڵاواتی زۆر بكرێت و بە مەبەستی پاكبوونەوە و لێخۆشبوون لە خوای میهرەبان بپارێتەوە، دەبێت ئەمانە وەك مەرجە ناچارییەكان ببینرێن.

بێگومان جەنابی اللە، تەوبەكاران و پاكەوەبووەكانی خۆشدەوێت و هاوكاریانە.

## وەك مشك ڕەفتار مەكە!

قوتابی سكاڵای نەفسی خۆی لای مامۆستاكەی دەكات لەبەر ئەوەی ناتوانێت خۆی لە ڕوانینی حەرام بپارێزێت. بە مامۆستاكەی دەڵێت:

- مامۆستا چارەسەر چییە بۆ ئەوەی نەڕوانینە حەرام، پێویستە چی بكەم؟ مامۆستا لە وەڵامدا وتی:

- كوڕم، بیر لە مشك بكەوە. كاتێك زانی قوتابییەكە تێناگات بۆی ڕوون كردەوە،

- ژیریی مشك لاوازە، یەكسەر شتەكان لەبیر دەكات. خواردنێك دەبینێت، بۆی دەچێت تا بیخوات و وای لێدێت خەریكە بە تەڵەكەوە ببێت، بۆیە ڕادەكات. بەڵام ئەم مەترسییە لەبیر دەكات و دووبارە هەوڵدەدات. لە ئاكامدا دەبێت بە تەڵەكەوە و دەتۆپێت. مامۆستا بەردەوام بوو لە قسەكانی و وتی:

- تۆ عاقڵیت، كە مەترسیت بینی، وەك مشكێك مامەڵە مەكە! یەكسەر دووربكەوەرەوە، قوتابییەكەش وتی:

- زۆر باشە مامۆستا.

بۆ ڕۆژی دواتر چووە بازاڕ و لەو كاتەدا كە خەریكبوو چاوەكانی بچنە سەر حەرام، وتەكانی مامۆستاكەیی بە بیردا هاتەوە و بیری لەوە كردەوە كە ئەم مشك نییە و دەموچاوی وەرگێڕا و وتی:

"من مشك نیم... من مشك نیم..." بەم جۆرە هەر کە دەمویست بۆ حەرام بڕوانێت ئەمەی دووبارە دەکردەوە.

## بەڵای مەراق و بێشەرمی

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ (الإسراء: ٣٦)

"(ئەی مرۆڤ) لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە."

دەوترێت کە مرۆڤ چی بەسەردا بێت لە مەراقەوەیە، دیارە ئەمەش بە زیادەوە پێکاویەتی. چونکە مەراق و حەزکردن بە زانینی شت دایکی زانستە و گەر لە شوێنی نەگونجاودا بەکارهات وەك باوکی گوناهی لێ دێت. بەتایبەتیش بۆ منداڵان و گەنجان.

چاخی منداڵی ئەو قۆناغەیە کە چڕترین ئارەزووی زانین لەخۆ دەگرێت. لەم سایەیەدا منداڵ زانیاریی خۆی دەربارەی ژیان بەرەوپێش دەبات و دەبێتە تاکێکی ئامادە بۆ ژیان. بەڵام وەك چۆن پێویستە لە خواردن و خواردنەوەکانیشدا باشەکانیان هەڵبژێرین و لە خراپ و زیانبەخشەکانیشیان دوور بکەوینەوە، بە هەمان شێوە مەرجە بەباشی ئەو شتانە هەڵبژێرین کە پێویستمان بە فێربوون و زانینیان هەیە. ژەهراویبوون بە خواردن و خواردنەوە ژەهراوییەکان چەندێك بۆ ژیانی دونیامان زیانبەخش بێت، وتە و دیمەنە زیانبەخشەکانیش لانی کەم هێندە مەترسیدارن لەسەر ژیانی دونیا و دواڕۆژمان.

بەردەوام دەبینین کە دایك و باوکان لە بابەتی خواردنی منداڵەکانیاندا چەندە هەستیاری دەنوێنن. بەڵام بەداخەوە دەبینین بەشێکی زۆری هەمان ئەو دایك و باوکانە هەستیاریی هاوشێوە نانوێنن لەمەڕ ئەو شتانەی دەچێت بۆ گەدەی عەقڵ و دڵی منداڵەکانیان. دەزانین کە ئەو خۆراکەی لە ڕێی دەممانەوە دەچێتە گەدەمان و بە شێوازێکی دیاریکراو خۆراکی جەستەمان دەدات، هەر بەم جۆرە ئەو دیمەن و دەنگانەی کە لە ڕێگەی چاو و گوێیەکانەوە وەردەگیرێن، لە ڕێی ڕۆیشتنیان بۆ گەدەی عەقڵ و دڵەوە شکڵ و شێوە دەدەن بە پێکهاتەی زیهنی و ڕۆحی ئەو کەسە.

سەبارەت بە منداڵان، هەڵدانیان لەسەر هەموو بابەتێك و ویستی وەرگرتنی زانیارییان دەربارەی هەموو بابەتێك، ویستێکی ئاسایی و پێویستە. هەست و مەراقی شتزانین بۆ ئەو کەسەی کە عەقڵی بە مەعریفە و دڵی بە خۆشەویستی پڕکردووە ڕۆڵی خێراکەرێکی کاریگەر و بنەڕەتی لە گەشەسەندنی ماددی و مەعنەویی ئەو کەسەدا دەگێڕێت. لەم حاڵەدا گرنگترین ئەرك دەکەوێتە سەر شانی دایك و باوکان کە ئاڕاستەکەری منداڵەکانیانن.

گەر مەراق و حەزی منداڵ بەباشی ئاڕاستە بکرێت، کۆمەڵگا چەندین زانای تێدا هەڵدەکەوێت. بە پێچەوانەشەوە گەر بە ئاڕاستەیەکی هەڵەدا ڕۆشت ئەو کات کۆمەڵگا دەبێتە مۆڵگەی پیاوخراپان. چونکە تواناکانی مرۆڤ وەك چەقۆی دوولاتیژ وەهان. دەتوانرێت ئاگر هەم بۆ سوتانی ماڵ و هەم بۆ چێشتلێنانیش بەکار بهێنرێت. توانای منداڵانیش بە هەمان شێوەیە. گەر ئەو لایەنانەی کە بە ڕووکەش زۆر ڕووخێنەر دیارن بەباشی ئاڕاستە بکرێن دەکرێت ببنە هۆکاری خێری زۆر گەورە.

ئەو منداڵەی مەراقی زانین و بینینی هەیە، کاتێك ئامێر و هۆکارەکانی وەك تەلەفیزیۆن و ئینتەرنێتی دەدرێتە دەست، دەیەوێت چاوی بە سەرجەم کەناڵ و پێگەکان بکەوێت. دیارە ئەم ویستەش لە سروشتی منداڵدا شتێکی ئاساییە. بە شێوازێك منداڵەکە هەستی بێبەشبوونی لا دروست نەبێت و، لەنێو ئەو کاژێرانەدا کە دایك و باوك دیاری دەکەن و بە ڕەچاوکردنی سنوورێك بۆ کۆمەڵێك کەناڵ و سایتی دیاریکراو، پێویستە ئەم خواست و ویستی زانین و چێژوەرگرتنەی منداڵان پڕ بکرێتەوە. بە پێچەوانەوە کاتێك ئارەزووە ڕێلێگیراوەکان دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێت، وەك ئاو کە بەنداوەکەی بەردەمیشی ڕادەماڵێت و دەیبات، دەبنە هۆکار بۆ دەرەنجامی زۆر ڕووخێنەرتر.

بە داخەوە دەبینین کێشەی گەورەی ئەمڕۆمان ئەوەیە کە دایك و باوکان لە تەمەنێکی بچوکەوە میکانیزمی کۆنترۆڵکردنی گونجاو وەك پێویست بۆ منداڵەکانیان پەیڕەو ناکەن و هۆکاری جێگرەوەی زانیاری و چێژوەرگرتنیان بۆ دەستەبەر ناکەن. گەر بە منداڵێکی زانینخواز بڵێین "ئەوەندە حەز بە شتزانین مەکە!" و بە منداڵێکی بزێو بڵێین "بوەستە!" هێندە ڕێنوێنییەکی بێمانا دەبێت وەك ئەوەی بە بەردێك کە هێزی ڕاکێشانی زەوی لەسەرە بڵێین "مەکەوە!" و، بە ئاوی بە خوڕی هەڵقوڵاویش بڵێین "هەڵمەقوڵێ!"

لە بابەتی ئاوە بەخوڕەکەدا ئەوەی پێویستە بکرێت، بە واتای فەرمانی "بەم ئاڕاستەیەدا هەڵبقوڵێ" دەبێت هەستین بە دروستکردنی جۆگەی ڕێکوپێك تا بەرەو ئاودانی باخچەکان ئاڕاستەی بکەین. ئەرکی سەرەکی دایکان و باوکانە جۆگەی پێویست دروست بکەن بۆ ئاودانی باخچەکانی دڵ و عەقڵی منداڵان تا میوەی خۆشەویستی بگرن. بەپێچەوانەوە ئاوەکە دیسان بە بێسەروبەریی خۆی هەڵدەقوڵێت، بەڵام باخچەی عەقڵ و دڵان هەندێکیان

هەر بە وشکی دەمێننەوە و هەندێکی تریان دووچاری لافاو دێن و هەرگیز بەرهەمی پڕبەرەکەتیان نابێت.

ئەوەی لە گەنجێتیدا کەسێتی مرۆڤ دیاری دەکات، لە دایك و باوك زیاتر ژینگەیە. یەکەمین ئەرکی سەر شانی دایك و باوك لەم چاخەدا بریتییە لە هەوڵدان بۆ ئامادەکردنی فاکتەرەکانی ژینگەیەکی تەندروست. وەك ئەو گوڵانەی لە فانوسدا بەخێو دەکرێن و ئەو ماسییانەی لە حەوزی ماسیدا گەورە دەکرێن، گەر منداڵ لە ژینگەی داخراودا گەورە بێت و نەبێتە خاوەنی زانیاریی پێویست دەربارەی ڕاست و ناڕاست و متمانە بە خۆی نەکات، دەکەوێتە ژێر چەکوشی هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکانەوە و زۆر بە زوویش لەمەدا شکست دەهێنێت.

ئەو بەشەش کە هێندەی زانینی باش و خراپ لە گەنجدا پێویستە بریتییە لەو متمانەیەی کە بە بەهاکانی خۆی هەیەتی. چونکە لە تەمەنی هەرزەکاریدا سەلماندنی ئەمە بۆ چواردەور هێندەی دروستبوونی کەسایەتیی گەنجەکە ڕۆڵی بەرچاو دەگێڕێت. دەزانرێت کە گەنج لە چاخی هەرزەکاریدا بۆ سەلماندنی گەورەبوونی خۆی دەست دەداتە جگەرە و مادده بێهۆشکەرەکان و بەو شێوەیە ئاشنایان دەبێت و دەست پێ دەکات. بە هەمان شێوە ڕێگەی چوونە نێو حەرامەکانی تریش هەر لێرەوەیە.

لە ئێستادا نەبوونی هاوڕێی کچ و ئەزموون نەکردنی کاری بەدڕەوشتی لە نێو گەنجانی ئاستی دواناوەندیدا وەك عەیبە نیشان دەدرێت، دایك و باوکان کە لەمە بێخەبەرن، وا دەزانن تەنها بە باسکردنی خراپیی ئەم ڕەفتارانە دەتوانن گەنجانیان لێ بپارێزن. بەڵام لەڕاستیدا سەرەتا پێویستە گەنج لە

بەرزیی ڕەهای بەهاکانی وەك عیففەت (پاکیزەیی) و نامووس و حەیا و شکۆ تێبگات کە خاوەنیانە. بە تێگەیشتن لەمە وای لێ دێت ئەم بەهایانە لە ئەستۆ دەگرێت و لە ئاکاریدا ڕەنگیان پێ دەداتەوە و، ڕەنگپێدانەوەی ئەم ئاکارانە و گەیاندنیان بە خەڵکی دەبێتە خولیای سەری. لەمڕۆماندا هۆکاری شیاو و ڕێکوپێك لەبەردەستدایە بۆ بەخشینی زانیاری و چێژ بە منداڵان، گەنجانیش پێویستیان بە بوونی ئاڕاستەی گونجاوە بۆ بەرجەستەکردنی حەز و خولیاکانیان لە بوارە وەرزشی و هونەری و بیرمەندییەکاندا بە شێوازێکی تەبا لەگەڵ بەها بەرزەکاندا تا بتوانن لە ئاستێکی باڵای جوانیدا ئەدایان بکەن. دیسان بۆ پێگەیاندنی تاکێك کە لە تێکەڵبوون بە دونیا سڵ نەکاتەوە و، لە نێو دونیاشدا شەرم لە بەهاکانی خۆی نەکات و، متمانەی تەواوەتیی بە بەها ڕەسەنەکانی هەبێت، ئەرکی سەرەکی دەکەوێتەوە سەر دایکان و باوکان.

ئەوەی پێویستە لەمڕۆدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەربەستی مەراق و شەرمی منداڵان و گەنجان بکرێت بریتییە لە:

* کۆنترۆڵکردنی منداڵان.

* بنیاتنانی میکانیزمەکانی کۆنترۆڵکردنی خود لە گەنجاندا.

* خستنەڕووی هەڵبژاردەی جێگرەوەی گونجاو بۆ منداڵان لە ناو ماڵدا.

* سازدانی ژینگەی ڕێکوپێك لە دەرەوەی ماڵ بۆ گەنجان.

* دروستکردنی هەستی متمانە بە دایك و باوك لە نێو منداڵاندا.

* بەهێزکردنی متمانەی گەنجان بە بەهاکانی خۆیان.

پشت بە خوا لە بەشەکانی داهاتوودا چۆنێتی بەرجەستەکردنی ئەمانە ڕوون دەکەینەوە.

## بەڵای ژینگەی خراپ

پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرموویەتی "سێ کەس هەن، کاتێك مرۆڤەکان لە مەحشەردا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت، ئەمان لە سێبەری عەرشی پەروەردگاردا دەدوێن. ئەمانەش:

١. ئەو کەسەی لە ڕێگەی خوای پەروەردگاردا لۆمەی هیچ لۆمەکارێك کاری تێ ناکات.

٢. ئەو کەسەی دەست بۆ شتێك درێژ ناکات کە حەڵاڵی خۆی نەبێت.

٣. ئەو کەسەی تەماشای ئەو شتە ناکات کە پەروەردگاری مەزن حەرامی کردووە."[١]

ئەو کەسەی لە ئەنجامی بەڵای مەراق و شەرمکردندا دەکەوێتە نێو گوناهەوە، لەڕاستیدا ئەم دۆخەی پێ خۆش نییە و زۆریش هەست بە پەشیمانی دەکات. بەڵام بۆ هەستنەکردن بەو پەشیمانییە، بە بەهانەی جۆراوجۆر خۆی هەڵدەخەڵەتێنێت و هەوڵ دەدات دۆخەکە وەك شتێکی ئاسایی تەماشا بکات. تەنانەت وەك کەسێك کە ئاوی سوێر دەخواتەوە و بۆ زیاتر شکاندنی تینوێتییەکەی زیاتر لە ئاوە سوێرەکە دەخواتەوە، ئەو کەسەش کە گوناه دەکات تا هەست بە پەشیمانی بکات زیاتر ئەگەری نوقومبوونی نێو گوناهی هەیە.

لەم دۆخەدا شەیتان دەچێتە بەردەم ئەو کەسەی گوناه دەکات و بۆ ئەوەی لە پەشیمانی ڕزگاری بکات پێی دەڵێت "خەم مەخۆ، خۆ هەمووان هەمان گوناه ئەنجام دەدەن. هەرچییەك بێت هەمووان نەخۆشن."

گەر لەگەڵ ئەمەدا هیچ ئارامییەکی ڕۆحیشی دەست نەکەوێت، دەکەوێتە

١. علی المتقي، کنز العمال، رقم الحدیث: ٤٣٢٥٢.

بیری ئەوەوە کە بوونە هۆکاری گوناهەکە بۆ ئازاری ویژدان، شتێکی تا بڵێی ئاساییە.

بەڵام وەك چۆن نەخۆشکەوتنی کەسانی تر نابێتە هۆی چاکبوونەوەی نەخۆشییەکەی ئێمە، بە هەمان شێوە نوقومبوونی هەمووان لە گوناهدا نابێتە پۆزش بۆ ئێمە. بە هەزارەها ئەزموون سەلماوە کە ئەو دڵدانەوەیەی لە هاوبەشیی خەم و نەخۆشییەوە دەست دەکەوێت، سوودی بۆ هیچ کەسێك نەبووە. لەم حاڵەدا گەورەترین زیان ئەوەیە مرۆڤ دەست بکات بەوەی کردەوەیەکی گوناه بە کارێکی ئاسایی تەماشا بکات.

وەك چۆن دزیکردنی هەموو کەس، وا ناکات دزی ببێتە کارێکی ڕێپێدراو، ڕوانینی حەرام و ئەو حەرامانەی بەهۆی ئەوەوە دەرگایان لەسەر واڵا دەبێت و هیچ حەرامێکی تر لەبەر ئەنجامدانیان لە لایەن خەڵکەوە نابنە ڕێپێدراو.

پشت بە خوا شارەزابوون لە ژیانی پڕ نووری پێغەمبەری ئازیزمان و ئەو یاسایانەی هێناویانە ئەم گوناهانەمان لەبەر چاو دەخات و، لە ئەنجامیشدا هەوڵ و کۆششێکی زۆر و جددی بۆ وازهێنان لەم کردەوە خراپانە بەرپا دەکەین. لەبەر ئەوەی لەو شوێنانەی بە کۆمەڵ گوناهیان لێ دەکرێت، گوناهکردن ئاسانترە، ئەو کەشانەش کە کردەوەی خێریان بە کۆمەڵ تێدا ئەنجام دەدرێت، مرۆڤ دەخەنە ژێر وزە و کاریگەریی پۆزەتیڤی خۆیانەوە.

لەم دۆخەشدا دیسان شەیتان مرۆڤ بە سەربەستی جێناهێڵێت و لە لای ڕاستەوە بۆی دێت، پێی دەڵێت کە ئەم بەم ڕووەوە چیدی لایەقی چونە بەردەم حزووری پەروەردگار نییە و، لە ڕێگەی ئەستورکردنی پەردەی غەفڵەتەوە وای لێ دەکات واز لە پەشیمانی بهێنێت.

پەشیمانی وەك پاڵنەرێك وایە بۆ ئەوە دراوەتە مرۆڤ تا بە زوویی پەنا بۆ دوشی خاوێنبوونەوە بەرێت. بەڵام بەداخەوە زۆرێك لە گوناهکارەکان ئەم پاڵنەرە بۆ ڕاکردن لە خوا بەکار دەهێنن نەك بۆ پەنابردن بۆی.

چەندە لە ڕووشمان بێت، مادەم لە کۆتایی ژیاندا مردن و ڕۆژی لێپرسینەوە هەیە، مانای وایە بێجگە لەو هیچ دەرگایەکی تر نییە پەنای بۆ ببەین. لەم دۆخەدا عەقڵ داخوازی ئەوەیە بە ئاگری پەشیمانییەوە بەرەو دوشی تەوبە و پەشیمانی هەنگاو بنێین. گوناه خۆی لە خۆیدا دەستەوسانییەکی کاتی عەقڵە لەبەردەم هەستدا. چونکە دۆخی ئەو مرۆڤەی گوناه بە گوناه دەزانێت و لەپاڵ ئەم زانینەشیدا هەر ئەنجامی دەدات، وەك دۆخی ئەو پیاوە وایە کە بە تامی کاتیی پاقلاوەیەکی ژەهراوی هەڵدەخەڵەتێت و دەیخوات.

چونکە گەر هەنگوینی ژەهراوی چێژێکی کەمخایەنیش بە مرۆڤ ببەخشێت، پاش ئەوەی دادەبەزێتە خوارەوە بۆ گەدەی، ئەو کەسە دەتلێنێتەوە. بێگومان شتێکی تا بڵێیت نەشیاو دەبێت گەر ئەو کەسەی بە ژەهرەکەوە دەتلێتەوە بڵێت من لایەقی دەرمانخواردن نیم و دەست بکات بە خواردنی زیاتری پاقلاوەی ژەهراوی. ئەوەی لە سەریەتی بیکات ئەوەیە مێشکی بخاتەوە کار کە بۆ ماوەیەکی کاتی وەلای نابوو و، بە کاریگەریی پەشیمانییەکەشی سوودمەند ببێت لە دەرمانی ئەو ژەهرە، واتە بە پەنا بردن بۆ تەوبە داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگاری میهرەبان بکات. بەپێچەوانەوە گەر بۆ لە یادکردنی پەشیمانییەکەی گوناه بە گوناه داپۆشێت، وەك ئەوە دەبێت بڵێت ''خۆ من هەر دەکۆکم، ئیتر شێرپەنجەشم تووش ببێت جیاوازی نییە.''

شەیتان بە شێوازێکی جیاواز لای ڕاستەوە بۆ ئەو کەسانە دەچێت کە

گوناهـ و تەوبەی زۆر دەکەن پێیان دەڵێت "بەردەوام هەمان گوناهـ دەکەیت و تەوبە دەکەیت. تۆ شایان نیت بە لێخۆشبوونی خوایی. تەوبەش بکەیت خۆ دیسان هەر پیس دەبیتەوە." بەم شێوازە هەوڵ دەدات ڕێگاکانی تەوبەی لەسەر دابخات. چەندە کارێکی بێمانایە بڵێین "خۆ دیسان هەر پیس دەبمەوە" و ئیتر خۆمان نەشۆین و غوسڵ دەر نەکەین، بە هەمان جۆر وتنی کارێکی لە ڕادە بەدەر نالۆژیکییە لەبەر هەمان بیرکردنەوە تەوبە نەکەین کە پەشیمانییەکەمان داخوازیەتی و پەنا نەبەینە بەر ڕێگاکانی خاوێن بوونەوەی مەعنەوی.

لە هەمان کاتدا تەوبەکردن پارچەیەکە لە بەندایەتی. چونکە لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا ئازیزمان دەفەرمووێت "گەر ئێوە قەومێك نەبوونایە کە تەوبە و گوناهـ دەکەن. خوای پەروەردگار لەناوی دەبردن و لە شوێنی ئێوە قەومێکی بەدی دەهێنا کە گوناهـ بکەن و تەوبەی لەسەر بکەن."[1] لەبەر ئەوەی لە کاتی تەوبەکردندا تام و بۆنێکی جیاواز لە مرۆڤدا هەیە کە لە هیچ کاتێکی تریدا ئەم تام و بۆنەی نییە. لە پێغەمبەرانی مەعصومیشدا گەر ئەسڵی گوناهەکەش نەبێت، بوونی تۆزقاڵێکی هێندەی سێبەری گەردیلەیەکی، بە یادمان دەهێنێتەوە کە تەوبە چەندە بەندایەتییەکی بنچینەییە و سەرلەنوێ ڕووەرچەرخانەوەی پێغەمبەران بۆ لای پەروەدگار چەندە دۆخێکی پڕ بایەخە.

بەم جۆرە لە ڕێگەی هەڵسوکەوت بەم هەستی تەوبەیەوە هێڵی بەربەککەوتن سەرەتا بەرەو مەکروهەکان و پاشان بەرەو گومانلێکراوەکان و دواجاریش بەرەو چوارچێوەی ڕێپێدراوەکان ڕادەکێشین و لە بازنەی سەلامەتیدا دەمێنینەوە. بەڵام دواجار ئێمە مرۆڤین و هەردەم چاوەڕێی کەموکوڕی و لادانمان لێ دەکرێت.

---

١. مسلم، التوبة ١١؛ أحمد بن حنبل، مسند ٢٨٩/١، ٣٠٤/٢، ٣٠٩، ٤١٤/٥.

بێگومان تەوبە لە هەموو بازنەیەکی بەندایەتیدا بەردەوامی بە فەرمانداریی خۆی دەدات. کاتێك هەموو ئەمانە لەبەرچاو دەگیرێن، سەرلەبەر دەبنە هۆکار تا مرۆڤ بەرەو ئاڕاستەی دروست بدات لە شەقەی باڵ.

بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی بیرکردنەوەکانی وەك "بارودۆخەکە ئاوەهایە" و، "خۆ هەمووان دەیکەن!" و، "لەم سەردەمەدا هەر وا دەبێت" ببینەوە، پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین،

* پێویستە لە یادمان بێت کە تەنها خوای پەروەردگار بڕیار لەسەر باشی و خراپی و ڕاستی و هەڵەیی و جوانی و ناشرینیی کردەوەکان دەدات.

* ئەوەمان لە یاد بێت کە گەر حەرامەکان بە کۆمەڵیش ئەنجامدران چاوپۆشییان لێناکرێت.

* گەرچی لەگەڵ گوڵفرۆش و هاوڕێی بۆنفرۆشانیش بیت، بەڵام لە یادت نەچێت کە لە ناختدا ئارەزوویەکت بۆ ئەنجامدانی گوناهـ هەیە کە پێویستە خۆتی لێ بپارێزیت.

* گەر ئەو کەشەی تێیداین بووە هۆکار بۆ گوناهکردنمان، ئەوا پێویست دەکات لەو کەش و هەوایە دوور بکەوینەوە.

* دەبێت ئەوەش بزانین کە تەوبە و داوای لێخۆشبوون هاوشێوەی کاتی ناخۆشییەکان، لە ساتەوەختی خۆشی و بەختەوەریشدا پلە و پێگەیەکی حاشاهەڵنەگری هەیە.

### لەمەڕ خۆشەویستی

"شتێکت بۆ باس دەکەم و تۆش بە چاوەکانت دەبینیت: هیچ ئافرەتێکم نەبینی هەستی بە چاودێریکردنی لە لایەن پیاوێکەوە یان بیسترانی دەنگی کردبێت و دواتر هەڵسوکەوتگەلێکی زیاد لە پێویستی ئەنجام نەدابێت کە پێشتر هەرگیز نەیکردووە و، گوفتارگەلێکی دەرنەبڕیبێت کە پێشتر هەرگیز بە پێویستی نەزانیبون! ئەم هەڵسوکەوت و گوفتارە بێسوودانە تەواو پێچەوانەی هەڵسوکەوت و گوفتارەکانی کەمێك پێشتریەتی. بە هەمان شێوە، زۆر بەڕوونی ئەوەم بەدیکردووە کە ئافرەتان لەم کاتانەدا تۆنی دەنگیان گۆڕیوە و بایەخێکی گەورەیان داوەتە هەموو هەڵسوکەوتەکانیان. پیاوانیش کاتێك هەست بە بوونی ئافرەتان دەکەن بە هەمان شێوەن. دەرخستنی جوانییەکان و، ڕێککردنەوەی ڕۆشتن و، پێکەوەبوونی ئافرەت و پیاو و، گاڵتەوگەپی پیاو لەگەڵ ئافرەتدا، هەموو ئەمانە وەك ڕۆژی ڕوون ئاشکران، ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانەن کە لە هەموو جێیەك و لای هەمووان زانراون. مەگەر خوای گەورە وەها نافەرمووێت "بە ئیمانداران بڵێ بینایيان (لە ڕوانینی حەرام) بپارێزن، پاکیزەییان بپارێزن." لەبەر ئەوەی لەم بابەتەدا گومانباشیم لەگەڵ کەسدا بەکار نەهێناوە، بیرکردنەوەی شاراوەی هەم پیاوان و هەم ئافرەتانیشم زانی."[1]

## بەستنی بەردەکان و، تێبەردانی سەگەکان

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی "گەر کەسێك هاتە داخوازی کچتان و ئێوەش لە ئاین و خووڕەوشتی ئەو کەسە ڕازی بوون، ئەوە بیدەنێ. گەر وا نەکەن فیتنە و فەسادی گەورە لەسەر زەوی بڵاو دەبێتەوە." ئازیزمان ئەم وتەیەی سێ جار دووبارە کردووەتەوە.

---

١. إبن حزم، ملوانکەی کۆتر.

لەمرۆدا نیشاندانی خێر بە شەڕ و شەڕ بە خێر لە سەرووی گرنگترین کێشەکانەوە دێت. ئەمرۆ گەنجانی قۆناغی ئامادەیی چ کوڕ بێت یان کچ، گەر هاوڕێی ڕەگەزی بەرامبەری نەبێت، ڕەنگە لە لایەن چواردەورەکەیەوە بە بچوك تەماشا بکرێت. ئەو کەسەی لە ساڵانی سەرەتای دروستبوونی کەسایەتییدا دەرك بەوە ناکات کە عیففەت بەهایەکە و بێعیففەتیش لەدەستدانی ئەو بەهایەیە، وەك ئەو کرێکارەی بێخەبەرە لە نرخ و بەهای ئەو کاڵایەی هەڵی گرتووە، ئەگەرێکی زۆر هەیە ئەو شکۆیە لەکەدار بکات کە وەك ئەمانەتێك هەڵی گرتووە.

لەمرۆماندا ڕێگاکانی خراپە تا دێت زیاتر و ئاسانتر دەبن، دەشبینین نوێنەرایەتیکردنی چاکەش تا دێت سەختتر دەبێت. لە کۆمەڵگای ئەمرۆماندا باسکردن لە خراپیی کردەوە خراپەکان بە دەمامکی ویستی ئازادی مرۆڤەکان قەدەغەکراوە و، نوێنەرایەتیکردنی چاکەش مانای ڕووبەڕووبوونەوەی کرداری فشارێکی زۆری چواردەورە. ئەمرۆ گەنجێك دەتوانێت لە کافتریایەکدا یان لە هۆڵی چاوەڕوانی سینەمادا یاخود لە هۆکارێکی گواستنەوەی دەستەجەمعیدا بە بڕوابەخۆبوونێکی بێوێنەوە بگرە بە تەقەلایەکی زۆرەوە لەپێناو زامنکردنی بڕوابەخۆبوونەکەیدا بەرهەمەکانی بودیزم و هیندویزم یاخود ئەگنۆستیزم و بێباوەڕیی بخوێنێتەوە، کەچی هەمان گەنج ئەگەرچی ئیماندار بێت و بەڕاستیش حەز و ئارەزووی فێربوونی هەبێت، هێشتا دوورە لەوەی لە هەمان ئەو جێگایانەدا کتێبی پیرۆزی خۆی یان کتێبێکی فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەرەکەی بەئاسوودەیی هەڵبگرێت و بیخوێنێتەوە.

لەپشت دۆخی دەروونی ئەم مرۆڤانەوە کە بێبەشن لە بڕوابەخۆبوون لەمەڕ بەها ڕەسەنەکانی خۆیان، زیاد لە فشاری چواردەور دەستەوەستانییان بەدی

دەکرێت لەبەردەم ناتاگاهییاندا. لەکاتێکدا ڕاهیبەکان لە زنجیرە و دراماکاندا وەك بێزراوترینی مرۆڤەکان دەناسێنرێن و وەك پیاوە ئایینییە جبە ڕەش و ریشپیسەکان نمایش دەکرێن، بێگومان ئەو گەنجانەش کە لە پەروەردەی ئەم جۆرە بەرنامانەدا شکڵ و شێوە وەردەگرن، لە خاوەندارێتیکردنی بەهاکانی خۆیاندا ڕووبەڕووی تەوژمی بەکەمبوون و بەکەمزانینی خۆیان دەبنەوە.

ئەم دۆخی بێهەستییە بەرامبەر بەرپرسیارێتی کە تا بەها ئەخلاقییەکان ڕۆیشتووە، گەر لەو خاڵەدا کە بەریەککەوتن لەگەڵ بەها بیروباوەڕییەکاندا بە خۆوە دەبینێت، لە زانینی خۆیدا پەناگەیەکی پتەوی ڕاستییەکانی ئیمان بدۆزێتەوە (سەرەڕای ئەو داڕمانەی بەسەریدا هاتووە)، ئەو کەسە دیسان پێویستی خۆبنیاتنانەوە لە خۆیدا هەست پێ دەکات و دەچێتە نێو پرۆسەیەکی بنیاتنانەوەوە. لەم خاڵەدا ژینگە و کۆمەڵگا فاکتەری سەرەکین، پێویستە ئەو ژینگەیەی ئەو خێزانە و ئەو گەنجەی لەخۆگرتووە زۆرلێکەر نەبێت و ئاسانکار بێت و، بێزراو نەبێت و مژدەبەخش بێت و، بەم شێوەیە دەبێتە هەڵگری گرنگییەکی بنەڕەتی بۆ ئەو کەسەی کە لە خاڵێکی وەهادایە.

پێویستە بازنەی حەڵاڵ تەسك نەکرێتەوە و حەڵاڵەکانیش بە شێوازێکی ڕێکوپێك و سەردەمیانە بخرێنە ڕوو، بێگومان ئەمە چەمکێکی زۆر گرنگە لەمەڕ خاوەنداریکردنی گەنجان لە بەها ڕەسەنەکانی خۆیان و زیندووکردنەوەی ئەو بەهایانە. شێوازی نواندن و وێناکردنی بەهاکان کار دەکاتە سەر ئەوەی گەنجان ئەو بەهایانە بە بەشێك لە کەلتورێکی ئاستنزم دابنێن یاخود نا. لە هەمان کاتدا گەنج بە ڕادەی ئەو متمانەیەی بە بەهاکانی هەیەتی، لە نواندن و تەبلیغکردنیشیاندا درێغی ناکات.

ئەو گەنجە موسڵمانەی خواردنەوە کحولییەکان لەبەر حەرامییان ناخواتەوە، گەر نەتوانێت بەسانایی بیخاتە ڕوو کە ئەمە پێویستییەکی ئایینییە و لە کاتی نوێژدا هەڵنەسێت بڕوات بۆ نوێژکردن، ئەمە بەدەر لە لاوازیی ئیمان گوزارشت لە نەبوونی متمانە و شانازیی ئەو گەنجە دەکات بەرامبەر بەهاکانی خۆی. گەر بشتوانرێت بە ئیمانێکی بەهێزەوە ئەم لەمپەرانە تێپەڕێنرێت، لەئەستۆگرتنی ئەم بەهایانە لە هەموو ژینگەیەکدا لە هەمان کاتدا پەیوەستە بەوەی بەهاکان لە ڕووی زانیاری و ڕوانینەوە لە لایەن ئەو کەسەوە بە شێوازێك لە ئەستۆ بگیرێن کە نمونەی باڵا پێشکەش بکات.

کاتێك باس لەوە دەکرێت کە بازنەی حەڵاڵەکان فراوانە و پێویست بە چوونە نێو بازنەی حەرام ناکات و حەرامەکان وەك هەنگوینی ژەهراوی لەپاش یەکەم تامکردنیان زیانی درێژخایەن لەسەر مرۆڤ جێدەهێڵن، گەر زەمینەیەکی وا نەڕەخسێنرێت کە چێژە مەعنەوییەکانی نێو ئیمان لە هەرێمی ئاسوودەیی گەورەکانماندا و لە نێو ئەشق و شەوقی خانەداناندا بە گەنجان نەچێژرێت، سەرجەم باسە تیۆرییەکان بەهەدەر دەچێت و تاکیش ئەو کاتە چەق دەبەستێت و دەرفەتی ژیانی نابێت. چونکە بێگومان بۆ ئەو تاکەی پێی دەوترێت "تەماشای حەرام مەکە، حەرام مەچێژە و بەرەو حەرام هەنگاو مەنێ"، هەستیارترین بابەت بەستنەوەی ئەمەیە بە ئامانجێکی پتەوەوە.

ئەمڕۆ پرۆسەی هاوسەرگیری بۆ ئەو گەنجانەی لە تەمەنی هاوسەرگیریدان، بە سەدان مەرجەوە بەستراوەتەوە. ئەو گەنجەی بە دوای نمونەییترینی هەلومەرجەکاندا دەگەڕێت تا خۆی بە ئامادە بزانێت بۆ هاوسەرگیری، کە دێتە چاخەکانی ناوەڕاستیش هەستیارتر و بژاردەتر مامەڵە دەکات، لە بەرامبەردا بۆ چەندین تایبەتمەندی دەگەڕێت و بەم جۆرە بابەتەکە

دەخاتە دۆخێکی ئاڵۆزەوە. بە هاوبەشیکردنی خێزانەکانیش بابەتەکە هێندەی تر دەبێتە مەتەڵ. بەڵام لە ڕاستیدا کەس نازانێت ئەو کەسە بەدەست ویستە مرۆییەکانییەوە دەناڵێنێت یان نا، یاخود ڕەنگە کەس مێشکی بە گیرۆدەیی و زامەکانی ئەو کەسەوە ماندوو نەکات. لەو ماوەیەدا کە لە تافی هەرزەکارییەوە بەرەو تەمەنی هاوسەرگیری درێژ دەبێتەوە، تاکەکان زۆر بڕیاردەرن لەمەڕ ژیانی داهاتوویان. لەم ماوەیەدا ئەزموونی ئەو گەنجانەی کە ناتوانن خاوەندارێتی لە بەها ڕەسەنەکانیان بکەن، لە ئەزموونی هاوسەرگیری و بەم جۆرە لە دامەزراوەی هاوسەرگیریدا ڕەنگ دەداتەوە و لە ئاکامدا خێزانی دابڕاو لە بەهاکان دێتە ئاراوە. لەم کاتەدا بیر لە ئەنجامدانی حەرام و بەستنی پەیوەندیی نادروستی دەرەوەی هاوسەرگیری دەکرێتەوە بە جۆرێك وەك ڕێگایەك دێتە پێش چاو کە ئاسانە و بەرپرسیارێتی دونیایی ناخاتە ئەستۆی خاوەنەکەی، لەبەر ئەوە قورسکردنی هاوسەرگیری دەبێتە هۆکاری دارمانێکی خراپی کۆمەڵایەتی. بەداخەوە دایك و باوکی موسڵمانیش زوو زوو دەکەونە داوی ئەم تەڵەیەوە کە بەناو مەدەنیەت هێناوێتیە کایەوە.

گەر لە دۆخێکی وەهادا گەنجان داماڵرابن لە متمانە بە بەهاکانی خۆیان و کەوتبنە ژێر فشارێکی دەرونی و کۆمەڵایەتییەوە و لە چوارچێوەی بازنەیەکی ڕێکوپێکدا نەبن و دەستیان نەگەیشتبێت بەو سەرچاوانەی کە پشتی زانستە ئایینییەکانیان دەگرێت و دەوڵەمەندیان دەکات، ئەو کات ئەو نەفسەی کە ئارەزووە مرۆییەکانیان دەجوڵێنێت و منێتییان دەخاتە ژێر فشارەوە، چیدی لەبەرامبەر فشارە دەرەکییەکاندا خۆی پێ ڕاناگیرێت.

ئەوەی پێویستە لەبەرامبەر ئەم دیمەنە خراپەدا بکرێت بریتییە لە:

* لەم زەمینەدا کە پێخزان زۆر ئاسانە، وەك چۆن لە ڕێگا سەهۆڵبەندەکاندا مرۆڤەکان دەستی یەك دەگرن تا نەکەون، پێویستە ئێمەش لەگەڵ ئەو کەسانەدا ڕێ بکەین کە بە ژینی ڕێکوپێکی خۆیان ڕێنوێنی خێرمان دەکەن.

* دروستکردنی ژینگە و ناوەندێکی ئاستبڵندی کەلتوری و هونەری لە بازنەی حەڵاڵدا.

* لە ڕووی زانست و ڕەفتارەوە ببینە کەسانی پێگەیشتوو و، ئەو متمانەیە نوێ بکەینەوە کە بە بەها ڕەسەنەکانی خۆمان هەمانە و، ئەمەش بڵاو بکەینەوە بۆ ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی کە دوێنراومانن و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین.

با بە یارمەتی پەروەردگار پێکەوە شێوازی بەجێهێنانی ئەم خاڵانە ببینین.

### پاکەکان بۆ پاکەکان

عامری کوڕی شوعەیب لە ڕێگەی باوکی و باپیریەوە دەگێڕێتەوە "زاتێك هەبوو پێیان دەوت مەرسەد ئیبن ئەبی مەرسەد (رضيَ اللهُ عَنْهُ). لە مەککەوە دیلی دەبردە مەدینە. جارێکیان بەڵێنی بە یەکێك لە دیلە مەککەییەکان دابوو بیبات بۆ مەدینە. (با لە خۆیەوە گوێبیستی چیرۆکەکە ببین): عەناق کە یەکێك بوو لە ئافرەتە سۆزانییەکانی مەککە، سێبەری منی بینی و ناسیمیەوە. وتی:

"تۆ مەرسەدیت وا نییە؟" منیش وتم:

"بەڵێ مەرسەدم."

وتی "سڵاو، بەخێربێیت، وەرە ئەمشەومان لە لا بەسەربەرە!"

منیش وتم:

"نەخێر، ئەی عەناق، خوا زینای حەرامکردووە." پاش ئەمە ئافرەتەکە هاواری کرد "ئەی ئەهلی خێوەتگە، ئەم پیاوە دیلەکانمان دەبات!"

هەشت کەس کەوتنە دووم. ڕێی شاخی خەندەمەم گرتە بەر، چوومە نێو ئەشکەوتێکەوە. ئەوانەی دوام کەوتبوون هاتن و دەمی ئەشکەوتەکەیان لێگرتم. لە سەرمەوە میزیان بەسەرما کرد. میزیان بەر سەرم کەوت. بەڵام خوای گەورە نەیهێشت بمبینن. پاشان گەڕانەوە.

منیش گەڕامەوە لای هاوڕێکەم. کردمە کۆڵم. کەسێکی قورس بوو. هاتمە ئەو شوێنەی پێی دەوترا ئیزهیر. لەوێ کۆت و بەندە ئاسنینەکانیم کردەوە. بە کۆڵ هەڵمگرتبوو، زۆر ماندووی کردبووم. دواجار گەیشتمە مەدینە. چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) و پێم وت:

"ئەی نێردراوی خوا، عەناق بخوازم؟"

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) وەڵامی نەدایەوە. پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارێ:

﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (النور: ٣)

پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریك مارە دەکات، ئافرەتی زیناکەریش تەنها پیاوی زیناکەر یاخود موشریك مارەی دەکات. (هاوسەریتی پیاوان و ئافرەتانێك کە بەردەوامن لەسەر زینا)، ئەوە لەسەر ئیمانداران حەرامکراوە.

لەسەر ئەم سروشە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) پێی فەرمووم:

"ئەی مەرسەد، ئەو پیاوەی زینا دەکات، دەتوانێت تەنها لەگەڵ

ئافرەتێکی زیناکەر یان بتپەرستدا هاوسەرگیری بکات. لەگەڵ ژنی زیناکەریشدا تەنها پیاوی زیناکەر یان بتپەرست دەتوانێت هاوسەرگیری بکات، هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودا مەکە!"[1]

## بەڵای بێهاوڕێیی

"دوور بکەونەوە لەوەی لە شوێنێکدا بەتەنها لەگەڵ ئافرەتێکدا بن. سوێند بەخوا کاتێك کەسێك لەگەڵ ئافرەتێکدا بەتەنها دەمێنێتەوە، شەیتان دەچێتە نێوانیانەوە. گیرخواردنی کەسێك لەگەڵ بەرازێکی قوڕاویدا باشترە لە دەستبردنی ئەو کەسە بۆ ئافرەتێك کە حەڵاڵی نییە." (طەبەرانی)

ئەمڕۆ لە بەرنامە تەلەفیزیۆنییەکاندا پیادەکارییەکی نیەتپاکانە بەدی دەکرێت. بە بەکارهێنانی چەند سیمبولێك گروپی تەمەن یان بوون و نەبوونی توندوتیژی دیاری دەکرێت. بەهۆی لۆگۆیەکەوە ئەو بەرنامانەش دیاری دەکرێت کە دەکرێت بەخێزانی تەماشا بکرێن. خێزانەکانیش ئەم لۆگۆیە لە هەر بەرنامەیەکدا ببینن بە دڵی ئارامەوە منداڵەکانیان جێ دەهێڵن تا تەماشای بکەن.

ئایا لەڕاستیدا وایە؟ ئایا هەموو ئەو زنجیرانەی لۆگۆی خێزانییان لەسەرە باس لە خێزانی ئێمە دەکەن؟ ئەو منداڵانەی مویتەلای ئەو زنجیرانەن کە منداڵی بێباك و تەنانەت سەرکەش بەرامبەر دایك و باوك نیشان دەدات، کاتێك منداڵەکە هاوشێوەی ڕەفتارەکانی منداڵی ئەو زنجیرانەی لێ دەبینرێت، هەمان ئەو دایك و باوکەی کە خۆیان بۆ یەکەم جار بێبەرنامە کۆنترۆڵەکەیان دایە دەستی، سەرسامانە پێی دەڵێن "ئەم منداڵە چیی بەسەرهاتووە؟"، "ئەم

١. الترمذي، تفسير الصورة (٢٤) (٣١٧٧)؛ ابو داود، النكاح ٥، (٢٠٥١)؛ نسائي، النكاح ١٢.

منداڵە چووەتەوە سەر کێ؟" لەڕاستیدا نەک "ئەم منداڵە چووەتەوە سەر کێ؟" بەڵکو دەبێت بوترێت "ئەم منداڵە چووەتەوە سەر کام زنجیرە؟"

دایك و باوکان لەگەڵ منداڵەکانیاندا بەخەندەوە لەو زنجیرانە دەڕوانن کە لەنێو دیمەنە کۆمیدییەکاندا قاڵبی ژیانگەلێکی داهێزراو دەهێننە نێو خێزانەکانەوە، لەپاشاندا ئەم دایك و باوکانە سەرسام دەبن کاتێك هەڵسوکەوتگەلێك لە منداڵەکانیاندا بەدی دەکەن کە پێشتر چاوەڕوانی نەبوون، ئەو دیمەنانەی پێشتر نایەتەوە یادیان کە پێکەوە لەگەڵ منداڵەکانیاندا لە تەلەفزیۆن بینەریان بوون و هەڵەکە دەخەنە ئەستۆی جیناتی منداڵەکە.

مرۆڤی ئەمڕۆمان کاتێك لە زنجیرەیەکی بەناوبانگدا منداڵێکی قورئانخوێن و نوێژکەر و دەمبەزیکر دەبینێت وەك نامۆ تەماشای دەکات، بگرە بە نیسبەت هەندێکەوە دەبێتە مایەی لاقرتێ. بەڵام لە هەمان زنجیرەدا بەرامبەر دیمەنە لاساری و جادووگەرانەکان بچوکترین کاردانەوەیان لێ نابینرێت. هیچ لێپێچینەوەیەك لەوە ناکرێت ئایا زنجیرە خۆماڵییەکان تا چەندێك خۆماڵین و زنجیرە خێزانییەکانیش تا چەندێك بۆ خێزان گونجاون.

باشە با هەموو ئەمانە لە لایەك بوەستن، دەبێت بەو دایك و باوکە خۆشباوەڕانە چی بڵێین کە وا دەزانن هەموو بەرهەمێکی فیلمکارتۆن بێتاوانە؟ بێگومان ئەو دایك و باوکانەی بە دوای هۆکاری شەڕانیبوون و بێگوێیی منداڵەکانیاندا وێڵن، پێویستە لەپێشدا بەو فیلمکارتۆنانەدا بچنەوە کە منداڵەکانیان تەماشایان دەکەن. دایك و باوکانێك کە لە هەستیارترین تافی منداڵەکانیاندا، ڕادەستی ئەو فیلمکارتۆن و یارییە کۆمپیوتەرییانەیان دەکەن کە لە سەرەتاوە تا دوایی پڕە لە توندوتیژی، کاتێك دەبینن منداڵەکانیان

بە جلی دڕاوەوە دەگەڕێنەوە یان دەبنە بەشێك لە چەتەیەکی بەناو گرووپی هاوڕێوە، دەست دەکەن بەوە لە دەرەوەی ماڵ بە دوای هۆکاری ئەمەدا بگەڕێن، نەك لە ناو ماڵەکە خۆیدا.

ئەمڕۆ لە ڕێگەی فیلمکارتۆن و زنجیرەی منداڵان و زنجیرەی گەنجانەوە هێرشێکی پلان بۆ داڕێژراو بۆ نەوەکەمان لە ئارادایە. ڕەنگە لەنێو خوێنەرانی ئەم نووسینەدا کەسانێك بڵێن "دیسانەوە باسی تیۆری پیلانگێڕی (Conspiracy Theory) مان بۆ دەکات!" نەخێر ئەمە ڕوون و ئاشکرا بەشێکی گرنگە لە پیلانێکی گەورە کە ڕاوێژی لە نێو تاقمێك ڕۆحی بەدا لەسەر دەکرێت و بە بەرنامەیەکی دیاریکراو و هەنگاوبەهەنگاو دەخرێتە مەیدانی جێبەجێکردنەوە. بەداخەوە دەبینین کە ئەم پیلانە، هەموو هەنگاوەکانی بەئاشکرا دەچێتە سەر.

ئەم هێرشە پیلانگێڕییەی بەرامبەر پێکهاتەی خێزانیمان دەکرێت کە ڕەگەکەی دەچێتەوە سەر ئایینە پیرۆزەکەمان، سەرەتا بە نیشاندانی هاوڕێیەتی کوڕ و کچ وەك دیاردەیەکی ئاسایی دەست پێ دەکات، پاشانیش لەسەر هێڵی نیشاندانی پەیوەندیی دەرەوەی هاوسەرگیری و هاوڕەگەزبازی وەك دیاردەی ئاسایی بەردەوام دەبێت. ئەمڕۆ لەکاتێکدا مەفهومی هاوڕێیەتی کوڕ و کچ لە ڕێگەی زنجیرەکانی منداڵانەوە دەبرێتە نێو منداڵانی قۆناغی بنەڕەتییەوە، نمونەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی هاوسەرگیری و بیرۆکەی یاخیبوونیش لە ڕێگەی زنجیرەکانی گەنجانەوە دەبرێتە نێو گەنجانی ئاستی ئامادەییەوە و وەك حاڵەتی ئاسایی نیشان دەدرێت.

پڕۆگرامەکانی بەناو پێشبڕکێش لە لایەکەوە خەیاڵاتی سەیر سەیر دەخەنە مێشکی گەنجانەوە و، لە لایەکی دیشەوە ئارەزووە بێزراوەکانی هاوشێوەی هاوڕەگەزبازی وەك دیاردەی زۆر ئاسایی لە هۆش و بیردا دەچەسپێنن. پێویستە زۆر بەڕوونی بیڵێین کە لەڕاستیدا ئەمڕۆ ئەو دایك و باوکانەی ناتوانن لە مەسەلەی تەماشاکردنی ئەم زنجیرانەدا هیچ سنوورێك بۆ منداڵەکانیان دیاری بکەن یان خۆیان نایکەن، سبەینێ کە منداڵەکانیان پەیوەندیی پێش هاوسەرگیرییان بەست یان هەڵبژاردەیەکی جیاوازی ڕەگەزییان کرد، ئەو کات هەموو داد و بێدادێکیان بێمانا دەبێت.

لەم سەرجەمی ئەم دژایەتییە بەرنامە بۆ داڕێژراوانەی نێو مەیدانەکانی میدیای بینراو و نووسراودا، ئەوانەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ سنوورەکانی خۆیان بەرەو پاش دەگەڕێننەوە، بەداخەوە مرۆڤە باوەڕدارەکانن. گەر پێویست بێت وێنەیەکی ڕوون بخەینە پێش چاو، دەبینین جاران زۆربەی خەڵك لەبەرامبەر دیمەنێکی نەشیاودا پلاکی تەلەفزیۆنەکانیان لێ دەکردەوە ، بەڵام بەداخەوە لە ئێستادا لەبەرامبەر دیمەنی ناشرینتردا تەنها بە وتنی ''چك چك''ێك وازدەهێنێت و پێکەوە لەگەڵ خێزانەکەیدا ئەو فیلمانە تەماشا دەکات کە بە "زنجیرە ناوخۆییەکان" ناو دەبرێن. ئەمڕۆ کۆمەڵێك زنجیرەدراما کە بە "زنجیرەکانی گەنجان" ناودەبرێن و گەنجانیشمان سەربەستانە تەماشایان دەکەن، بەرچاوکەوتنی چەندین دیاردەی پەیوەندیی پێش هاوسەرگیریی لەو زنجیرانەدا بووەتە شتێکی تا بڵێیت ئاسایی، بەکارهێنانی ماددە کحولییەکانیش هێندەی بەکارهێنانی ئاو ئاسایی نیشان دەدرێت.

گەنجی ئەمڕۆمان بە ئەندێشەی "دەبێت عاشق ببم"ەوە دەکەوێتە دوای ئەو هەستە هۆڕمۆنییانەوە کە بەتاڵ کراونەتە نێو بیر و هۆشییەوە و لە

ڕووکەشدا بێتاوانن، ئیدی کاژێرەکانی و خەیاڵ و هەستەکانی لەپێناو ئەو هەستانەدا بەهەدەر دەدات. کاتێك خەمبارانی تافی هەرزەکاری بەو هەستانەوە هەڵسوکەوت دەکەن کە وەك سەوزە بەهۆرمۆنگۆشکراوەکان لە ڕواڵەتدا گەشن کەچی لەڕاستیدا نادروست و بۆش و بێتام و بێبۆن و ناڕاستن، لە ئەنجامی تێکشکانی خەیاڵاتەکانیاندا دووچاری کەوتن دەبن، ئەمەش دەبێتە مایەی دروستبوونی ترس و وەڕزییەك کە بە درێژایی ژیانیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵی بگرن. بەم جۆرە بەشێکی زۆریان ئەومیەکی خەمۆك پێك دەهێنن کە پێویستی بە چارەسەرە.

ڕێنوێنیمان بۆ گەنجان ئەومیە خۆیان بەدوور بگرن لەو زەمینە خلیسکانەی بە فەتوای "ناخم پاکە" ی شەیتانانی جینني و ئینسی دەست پێ دەکات و بە ئەفسانەی "بێهاوڕێیی" بەردەوام دەبێت و دواجاریش بە ڕستەی "لەم سەردەمەدا وەهایە!" ئاسایی دەبێتەوە. وەك چۆن پێویستە لەسەر ئافرەت پارێزگاری لە ناموسی خۆی بکات، بە هەمان شێوە بێگومان پارێزگاریکردنی پیاویش لە پاکیزەیی خۆی ئەرکێکی مەزنە. لەنێوانیاندا هیچ جیاوازییەکی بەرپرسیارێتی نییە. هەروەها ئەم کرداری پارێزگارییەش لە پاراستنی چاوەکانەوە دەست پێ دەکات.

ئەوەی پێویستە بکرێت بۆ بەدووربوون لەم ڕێگە چەوتانە بریتییە لە:

* دوورکەوتنەوە لەو ڕاگەیاندنانەی کە گورگن و چوونەتە بەرگی مەڕەوە.

* ئیماندار لە ڕێگەی فیراسەتی ئیمانەکەیەوە دیوی پشتەوەی ئەو تابلۆ بەختەوەرییە درۆزنانە ببینێت کە ئەم ڕاگەیاندنانە نیشانی دەدەن.

* بەبێ ئەوەی بکەوێتە داوی بێبایەخییە ڕۆمانسییەکانەوە کە بە ڕواڵەت پاراو و بێتاوانن، بەبێ ئەوەی ببێتە زەبوونی گەڕانێکی تر بێجگە لەو کەسەی لەگەڵیدا بەختەوەر دەبێت و ژیانی بەختەوەری لەگەڵ دروست دەکات، پێویستە بە پاکیزەیی و ئیستیقامەتەوە ساڵەکانی تافی گەنجێتی تەواو بکات.

پشت بە خوا لە بەشەکانی داهاتوودا چۆنیەتی سەرکەوتووبوون لەم خاڵانەدا ڕوون دەکەینەوە.

## حەزرەتی ئادەم و حەوا

"بە ڕای من عەشق یەکگرتنەوەی ئەو پارچانەی ڕۆحەکانە کە لەنێوان بوونەوەرە جۆراوجۆرەکاندا بەش بەش بووە. ئەم یەکگرتنەوەیەش لە نێو بەرزترین توخمە بنچینەییەکانی ئەواندا دێتە مەیدان. دەزانین کە پێکەوەبوون و جودابوونەوە پەیوەندی بە یەکگرتن و لێکجودابوونەوەی بوونەوەرەکانەوە هەیە. هەر شکڵە و بەدڵنیاییەوە ئەو شکڵە بانگ دەکات کە بۆ خۆی گونجاوە، بەدوایدا دەگەڕێت و، دەیدۆزێتەوە. هەر شێوەیە و بۆ هاوشێوەکەیەتی. پێم وایە هەمووان دەزانن کە دژیەکەکان پاڵ بە یەکەوە دەنێن و هاوشێوەکانیش یەکدی ڕادەکێشن و، هاوچیزەکان لەگەڵ یەکدیدا دەگونجێن. بۆچی ئەم دۆخانە بۆ ڕۆحەکانیش بە هەمان شێوە نەبن؟ ئەو گەرمییەی پەروەردگار لە حەزرەتی حەوادا بە حەزرەتی ئادەمی بەخشیوە، دەگەڕێتەوە بۆ بەدیهێنانی حەزرەتی حەوا لە پارچەیەکی حەزرەتی ئادەم خۆی...."

## پاکەکان بۆ پاکەکان و، پیسەکانیش بۆ پیسەکان

﴿ ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ ۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ۖ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ (النور: ٢٦)

ژنانی ناپاك بۆ پیاوانی ناپاك و پیاوانی ناپوخت بۆ ژنانی ناپوخت، ئافرەتانی پاکیش بۆ پیاوانی پاك، پیاوانی پاکیش بۆ ئافرەتانی پاك، ئەو پاکانە بەدوورین لەو تۆمەتانەی کە ناپاکان هەڵی دەبەستن (چونکە محەممەدی پاك هاوسەری عائیشەی پاکە)، بۆ ئەو چاکانە لێخۆشبوون و رزق و رۆزی بەنرخ ئامادەیە.

"دەستت پیسە، دیشۆیت و دەڕوات." بەڵێ، بەداخەوە ئەم جۆرە وتانە هەن. گەر سەرنجتان دابێت نەموت پەندی پێشینان، چونکە ناکرێت ئەم جۆرە قسانە پەندی پێشینانی میللەتێك بن کە پاکیزەیی کردووەتە دروشم.

لەکاتێکدا هەڵسوکەوتێکی بەدڕەوشتانە بۆ ئافرەت دەبێتە پەڵەیەك بەسەر ناموسیەوە، ئیدی چۆن دەکرێت هەمان کردەوە بە نیسبەت پیاوەوە وەك لەکەیەك تەماشا بکرێت کە بە شوشتن خێرا لێ دەبێتەوە؟. بێگومان بەو شێوەیەی قورئانی پیرۆز باسی کردووە هەڵسەنگاندن و گۆشەنیگای ئیلاهی هیچ بەو شێوەیە نییە. لەبەر ئەوەی هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان ئەو گوناهەی ئافرەت دەیکات، لەگەڵ ئەوەی پیاودا. بێگومان ڕوانینی کۆمەڵگا و ئەگەریش منداڵی هەبێت، ئەو فشارەی ئافرەت ڕووبەڕووی دەبێتەوە تا بڵێیت گەورەترە، بەڵام لە ڕوانگەی گوناهەوە هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا نییە. ئەو کاریگەرییەی گوناه وەك پیسییەکی مەعنەوی لەسەر پیاو و ئافرەت جێی دەهێڵێت هەمان شتە. لە قورئانی پیرۆزدا جەنابی حەق ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێت کە ئافرەتە خراپەکان بۆ پیاوە خراپەکان و، پیاوە خراپەکانیش

بۆ ئافرەتە خراپەکان شیاون و ئافرەتە خاوێنەکان بۆ پیاوە خاوێنەکان و، پیاوە خاوێنەکانیش بۆ ئافرەتە خاوێنەکان شیاون. گومان لەوەدا نییە کە سەرجەم مرۆڤەکان بە خاوێنی دروستکراون. مانەوەی مرۆڤیش بە پاکی سەرەتا بەندە بە دەرککردنی بەوەی چی خاوێنە و چی پیسە، دواتریش بڕیاردانی لەسەر وەرگرتنی خاوێنەکەیان و ڕەتکردنەوەی پیسەکەیان.

ئایەتە پیرۆزەکە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە وەك سوننەتێکی خوای پەروەردگار، ئەوانەی سەرکەوتوو نابن لە مانەوەیاندا بە خاوێنی، هەرگیز ناگەن بە خاوێنەکان. بەداخەوە دەبینین زۆرێك لەو پیاوانەی سەردەمی گەنجێتییان بێگوێدانە حەرام و حەڵاڵ بەسەربردووە، بە خەیاڵی ئەوەی بە دەست شوشتنێك هەموو ئەوانە تێدەپەڕێنن، لە کاتی هاوسەرگیرییاندا بە دوای هاوسەری زۆر خاوێندا گەڕاون و لە ڕوانگەی ڕابردووی خۆیانەوە بە گومانی زۆرەوە لە کەسانی بەرامبەریان ڕوانیوە و لە ئەنجامیشدا، یان هاوسەرگیرییان نەکردووە، یان لەگەڵ کەسانی لایەقی خۆیاندا ژیانیان بەسەربردووە.

بێگومان خوای پەروەردگار تەوبەکارانی خۆشدەوێت، لەسەر ئەو بنەمایەش ئەوانەی تەوبەیەکی یەکجارەکی دەکەن و بڕیاردەدەن چیدی نەچنەوە سەر هەڵەکانی پێشوویان، ڕەنگە لەو سایەیەدا ژیان لەگەڵ کەسانی پاکتریش لە خۆیان پێکبهێنن. دەبێت ئەمەش وەك بەخشینێك تەماشا بکرێت کە خوای پەروەردگار لە خاتری تەوبەیەکی بنچینەییدا لەگەڵ بەندەکەیدا دەینوێنێت. بەدڵنیاییەوە ئەو بەخشینەش حوکمێکی تایبەتی هەیە کە دەکەوێتە ئەودیو چوارچێوەی قەزا و قەدەرەوە، ئەویش ئەو تایبەتمەندییەیەتی کە وابەستە بە گەڕانەوەی ئەو کەسە لە هەڵە و جەختکردنەوە و کۆششی جددی بۆ پاشگەزنەبوونەوە.

هەروەك نەخۆشییە جەستەییەکان، لە بابەتی حەرامەکانیشدا باشتر وایە خۆمان لە نەخۆشییەکانی بەدوور بگرین. لە قورئانی حەکیمدا کە هەر پیتێکی دەریایەکی حیکمەتە، خوای پەروەردگار نەیفەرمووە ''زینا مەکەن''، بەڵکو فەرموویەتی ''لە زینا نزیك مەبنەوە.''

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ (الإسراء: ٣٢)

''هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناهـ و تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر خراپە.''

بەڵێ، کەندی نێوان ژیانی ئیسلامی و ئەو سەفاهەتەی کە بە مەدەنیەت ناودەبرێت، تا بڵێیت قووڵ و فراوانە. وەك ناتوانترێت مەودای نێوانیان کەم بکرێتەوە، ئەوانەش کە هەوڵ دەدەن لە ناوەڕاستی هەردووکیاندا بمێننەوە، بەداخەوە بەرەو قوڵایی کەندەکە خل دەبنەوە و دەخنکێن.

بەڵێ، نزیکبوونەوە یەکەم هەنگاوی ئەو ڕێگایەیە کە بەرەو نوقومبوون دەچێت. سەرداری سەرداران (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئامۆژگاریمان دەکات کاتێك بە لای کۆڕی مەیخۆراندان دەڕۆین لێیان نەڕوانین. چونکە ئەوەی ئەمڕۆ لێیان دەڕوانێت، سبەی سەلامیان لێ دەکات، دوو سبەی دەمەتەقێیان لەگەڵ دەکات و، ڕۆژی پاشتر دادەنیشێت و لە ئاوەکەیان دەخواتەوە، ڕۆژی پاشتریش دەڵێت بە نیو پێك هیچ نابێت و بەو جۆرە دەرگای لەناوچوونی ئەبەدی بە ڕووی خۆیدا واڵا دەکات. زیناش بێگومان بە هەمان شێوەیە. ئەوەی ئەمڕۆ تەماشا دەکات، سبەی قسەی لەگەڵ دەکات، ئەمەش هەنگاو بە هەنگاو دەچێتە پێش و کە زۆر قسەی کرد دەستی دەگرێت، دواتر ماچی دەکات، ڕەنگە هەنگاوی پاش ئەو ماچەش بە زینا بگات.

بەم جۆرە ئەو ڕێگایانەی دەچنەوە سەر خێر، دەبنە مایەی خێر و دەستکەوتنی چاکە و ، ئەو ڕێگایانەش کە دەچنەوە سەر خراپە، خراپ و حەرامن. وەك چۆن پاداشتی نوێژێك بۆ هەر هەنگاوێکی ئەو پیاوە دەنووسرێت کە بەرەو مزگەوت ڕێ دەکات، ئەوانەشی ئەو کردەوانە ئەنجام دەدەن کە دەبنە هۆکار بۆ زینا، گوناهی ئەو حەرامەیان بۆ دەنووسرێت. دەکرێت چاو و گوێ و لوت و تەنانەت بیر و خەیاڵیش بەشیان لەم گوناهەدا هەبێت. دەرگای سەر ڕێگای زیناش هەمیشە والآیە، هەر لەبەر ئەوە دەبینین لە فەرموودە پیرۆزەکاندا ئازیزمان زۆر جەختی لەسەر ئەم بابەتە کردووەتەوە.

وەك هەموو گوناهەکانی تر زیناش لە زیهندا دەست پێ دەکات. لەبەر ئەوە ڕەنگە لە تەمەنی منداڵییەوە لە ئەنجامی پڕبوونی نائاگاهی بە دیمەنە ناشرینەکان و، بەگەڕکەوتنی خەیاڵ لەرێی پاڵەپەستۆی ئارەزووە جەستەییەکانەوە ئەو دیمەنانە ببرێنە نێو ژیانەوە. بیری مرۆڤ چەندە خاوێن بێت لە حەرام، هێزی خەیاڵیش بەو ئەندازەیە خاوێن دەمێنێتەوە و ئەو کات مرۆڤیش حەز و ئارەزووی حەرامی نابێت.

هەرگیز نابێت وێنایەکی پیسی نێو نائاگاهی مرۆڤ بەهۆی گوناهەکانی پێشوویەوە ببێتە داخوازی ئەوەی هەر لە سەرەتاوە مل بۆ ژێرکەوتەیی نەفس و شەیتان بدات. پێویستە کەسێکی وەها بە هەوڵ و تەقەلا و کۆششێکی زیاترەوە لەپێناو گوناه نەکردندا بکەوێتە دوای ئەنجامدانی کردەوەی چاك. خێردارترین کردەوەش لەم خاڵەدا ئەو دوعایەیە کە مرۆڤ بۆ خۆیی دەکات. هەندێك لە مرۆڤەکان بۆ داپۆشین یاخود بە خەیاڵی خۆیان ئاسانکردنی گوناهەکانیان (بە فرِوفێڵ و یارییەکانی شەیتان و نەفسی بەدخواز) گوزارشت لەوە دەکەن

کە گوایە نەیانتوانیوە و ناتوانن خۆیان بگۆڕن و، ئیدی ئەو گوناهەش بووەتە بەشێك لە سروشتیان.

بەم شێوەیە ئەو مرۆڤەی دەڵێت "من ناگۆڕێم، ماهیەتم وەهایە، خوا منی بەم جۆرە دروستکردووە"، مانای وایە بە دوای پۆزشدا دەگەڕێت و ئەم قسەیەش تەواو دوورە لە ڕاستییەوە. ڕاست نییە چونکە دەکرێت هەموو کەسێك لە ڕێگەی پەروەردەوە ببێتە کەسێکی باش و شایستەی بەهەشت. دەکرێت هەموو مرۆڤێك بگاتە پلەی ڕزگاربوون لە جەهەننەم. دەکرێت هەموو کەسێك بگاتە پلە و پایەی سوودبەخشبوون بۆ مرۆڤەکانی تر. ناردنی پێغەمبەرانیش لە لایەن خواوە بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕاستییە. فەرمانەکانی خوای گەورەش لە شوێنە جیاجیاکانی قورئانی پیرۆزدا دیسان ئەمە پشتڕاست دەکەنەوە.

پێویستە لە بەرامبەر ئەو پۆزشەدا کە دەوترێت "من ناتوانم گۆڕانکاری لە خۆمدا بکەم":

* گەورەیی بەهای ئەو ئیرادەیە وەبیر بهێنرێتەوە کە خوای پەروەردگار بە مرۆڤی بەخشیوە.

* بزانرێت کە مەبەست و ئامانج لە ناردنی پێغەمبەرەکان بەرزکردنەوەی پلەی مرۆڤە لە مرۆڤی ئاساییەوە بۆ مرۆڤایەتییەکی ڕاستەقینە و پڕ بەها.

* بەئاگابوون لە فێڵ و داوی نەفس و شەیتان و هوشیاربوون لەوەی کە ئەمەش یەکێکە لە یارییەکانی نەفس و شەیتان.

* بە ڕوانینی عیبرەت و وانەوەرگرتنەوە لەو کەسانە بڕوانرێت کە لە مێژوودا زەبوونی گوناهێك بوون و بە پێدانی مافی ئیرادەیان بوونەتە بەندەیەکی باش و گوێڕایەڵ.کاتێك مرۆڤ ڕوودەکاتە پەروەردگاری و، عەرزی حاڵی

پەرێشانی خۆیی بۆ دەکات و، بۆی دەردەخات کە لە حاڵی خۆی ناڕازییە و، بە دڵێکی شکاوەوە داوای لێ دەکات دەستی بگرێت و بەردەوامی بە حاڵی باشی بدات، بەم شێوەیە دوورییەکی حاڵی دەداتە دوعاکەی، ئیدی ئەو مرۆڤە لە ڕێدا جێماوە هەڵدەسێتەوە و لە ڕێگای پەروەردگاریدا بە ئەزموونگەلێکی دەگمەنەوە هەڵدەسێتەوە.

بەڵێ، پاکەکان بۆ پاکەکان و، پیسەکانیش بۆ پیسەکان، بەم جۆرە هەموو کەسێك دەگات بەو کەسەی کە لایەقیەتی. لەبەر ئەمە لەبری ئەوەی ڕاکردن بەرەو چێژە کورتخایەنەکان، هەڵبژاردەی مرۆڤی ژیر ئەوەیە هەوڵ بۆ دۆزینەوەی ئەو هاوژینە بدات کە لە ڕێبواریی ڕێی ئەبەدیەتدا هاوڕێیی دەکات. پشت بە خوا با پێکەوە چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەم هەڵبژاردنە ببینین.

## کاکی زاوا

خاوەنی کتێبی "مجمع الأنهر"، محمد بن سلیمان بە نازناوی "کاکی زاوا"وە ناسراوە. چونکە ئەم نمونەی پاکیزەییە لە سەردەمی خوێندنیدا نیوەشەوێك لەژێر ڕووناکی مۆمدا خەریکی موتاڵا و وانەخوێندن دەبێت. کاتێك سەرقاڵی موتاڵای زانستی دەبێت کەسێك لە دەرگاکەی دەدات. لەو کاتەدا بەو سەرسامییەوە کە هاتنی کەسێك دروستی دەکات و بە مەراقی ناسنامەی میوانەکەوە دەستبەجێ دەرگاکە دەکاتەوە. دەبینێت لە بەرامبەریدا کچێکی گەنج و جوان وەستاوە. میوانەکە پێی دەڵێت کە ڕێی بزرکردووە و لەبەر ئەوەی لەو چواردەورەشدا ڕووناکییەکی تری بەدی نەکردووە، ناچار بووە لە دەرگای ئەم بدات.

قوتابییە گەنجەكە ناتوانێت میوانەكەی ڕەت بكاتەوە، ناتوانێت لە تاریكی شەو و سارد و سەرمای شەقامەكاندا جێی بهێڵێت، بەناچاری فەرمووی هاتنە ژوورەوەی لێ دەكات. پاش ئەوەی سوچێكی نیشان دەدات تا تیایدا دابنیشێت و بحەوێتەوە، تا بەردەوام دەبێت لە وانە خوێندن و كۆششكردنەكەی. كچە داماوەكە بە نیگای شەرماوی و بەدزییەوە سەرنجی ئەم گەنجە دەدات، دۆخێكی گەنجەكە زۆر سەرسامی دەكات، گەنجەكە جارویار بۆ ماوەیەك پەنجەی لەسەر ئەو مۆمە ڕادەگرت كە لەبەر دەستیدا بوو و پاشان پەنجەی دەگێڕایە دواوە. گەنجەكە تا بەیانی ئەم جوڵەیەی چەندین جار دووبارەكردەوە، هەتا ڕۆژبوویە.

پاش خۆرهەڵهاتن كچە گەنجەكە ئەوێ جێ دەهێڵێت و دەچێتەوە بۆ ماڵەوە. بە هاوكاریی خەڵك ڕێی دەدۆزێتەوە و دەگاتەوە ماڵی خۆیان، ماڵەكەشیان كۆشكی یەكێك لە وەزیرەكانی ئەو سەردەمەیە، كچەكە خۆشی كچی ئەو وەزیرەیە. خەڵكی كۆشك بەمەراقەوە لێی دەپرسن چۆن و لە كوێ شەوی ڕابردووی بەسەربردووە، لەبەر ئەوەی بە درێژایی شەو بە دوایدا گەڕاون و نەیاندۆزیوەتەوە. كچە گەنجەكەش هەموو ئەو شتانە یەك یەك دەگێڕێتەوە كە شەوی ڕابردوو بەسەریدا هاتوون، بەتایبەتیش دۆخی سەرسامكەری ئەو گەنجەی كە میوانداریی كردبوو. وەزیرەكە ئەو گەنجە داوەتی كۆشكەكەی دەكات كە هاوكاریی كچەكەی كردووە و لێی دەپرسێت بۆچی بە درێژایی شەو پەنجەی بەو شێوەیە لەسەر گڕی مۆمەكە داناوە. گەنجە جوانڕوخسارەكەش دەڵێت "نەمدەتوانی میوانێك لە دەرەوە بەجێ بهێڵم كە ڕێی ونكردووە و هانای بۆ من هێناوە، لەبەر ئەمە ئەوم هێنایە ژوورە بچوكەكەمەوە. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تەڵەكانی نەفسیشم، جار جار پەنجەم دەخستە سەر ئاگری مۆمەكە كە ئاگری دۆزەخی وەبیر دەهێنامەوە. كاتێك شەیتان دەیویست هەڵم بخەڵەتێنێت، بە

دانانی پەنجەم لەسەر ئاگرەکە، سزای دۆزەخم وەبیر نەفسم دەهێنایەوە و بەو شێوەیە ڕزگارم بوو لە ئەنجامدانی کردەوەی نادروست."[1]

## ئایا تەماشاکردنی جوانی کاری چاکە؟

"ئەی عەلی، لە بەهەشتدا خەزێنەیەك هەیە بۆ تۆ، تۆش لە هەموو لایەکەوە خاوەنی ئەو خەزێنەیەیت. پاش بەرچاوکەوتنی یەکەم و لەناکاو دووبارە بۆی مەڕوانە. لە یەکەم بینین بەخشراویت، بەڵام لە سەرنجدانی دووەم جار نابەخشرێیت."[2]

تەماشاکردنی جوانی بێگومان چاکە و خێرە.

بەڵام توانستی ڕوانین بۆ جوانی بێکۆتایی جوانترینی هەموو جوانەکان و سەرچاوەی جوانی کە جەنابی حەقە، بەندە بە ژیانی مرۆڤ لەسەر ڕاستەڕێی ڕەزامەندیی ئەو. جوانییەکی وەهایە بە جۆرێك گەر هەموو جوانی بەهەشت کۆ بکەیتەوە هێشتا ناگات بە ساتێك ڕوانین بۆ ئەو جوانییە نەبڕاوەیەی ئەو.

گەر کەسێك وتی تەماشاکردنی جوانی خێرە و چاوەکانی بۆ سەیر و تەماشایەکی وەها برد و لە خاڵە زیانبەخشەکاندا بەکاری هێنا و ئەم ئامێرە ناسکەی بەهەدەردا چی بڵێین؟ وای دابنێین کامێرایەکی وێنەگرتن بە هاوێنە هەستیارەکەیەوە فڕێ دەدەینە نێو ئاوەوە و دەیخەینە ناو ئاگرەوە و دەیدەین بە زەویدا، ئایا کارێکی ژیرانەیە پاش هەموو ئەمانە بپرسین بۆچی کامێراکە کار ناکات؟ بە هەمان شێوە کاتێك ئەو چاوەی بۆ تەماشاکردنی جوانییە

١. م. فەتحوڵلا گولەن، ئیکسیری نەمری، بڵاوکراوەی گۆشەی ڕۆژنامەنووس و نووسەرەکان ٤٦-٤٧.

٢. منذري، الترغيب والترحيب، ٣٥/٣. (لە "أحمد"ەوە ڕیوایەتکراوە. ترمذي و ابو داودیش ڕیوایەتی هاوشێوەیان کردووە.)

ئەبەدییەکان پرۆگرامکراوە بە پێچەوانەی سروشتی خۆی و لە تەماشاکردنی حەرامەکاندا بەهەدەر دەدرێت، ئایا ژیرانەیە لەپاش ئەمەدا بپرسین بۆچی ناتوانین جوانیی جوانان ببینین؟

ئایا ئەگەر هەموو دونیا بە هەموو دەوڵەمەندییەکەیەوە بە ئێمە بدرێت ئامادەین لەگەڵ چاوێکماندا بیگۆڕینەوە؟

بێگومان نایگۆڕینەوە. بەڵام وەك چۆن حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) لە بەرامبەر تامکردنی میوەیەکدا سەرجەم جوانی و نیعمەتەکانی بەهەشتی لەدەستچوو، ڕەنگە ئێمەش بە تەماشاکردنی جوانییەك، بەهەشت و سەرجەم تایبەتمەندییەکانی و لەوەش گرنگتر بینینی جەمالی ڕاستەقینەمان لەدەست بچێت.

هەندێك کەس بۆ ئەوەی ڕوانینی حەرام ئاسایی بکەنەوە هەوڵ دەدەن وتەی "تەماشاکردنی جوان کاری چاکەیە" بە بەڵگەیەك بهێننەوە. ئەم وتەیە خۆی ڕاستە. وەك چۆن کارێکی چاکە مرۆڤ خواردنی چاك و خۆش بە جەستەی بدات و، خوای پەروەردگاری بناسێت و سوپاسگوزاری بێت. بەڵام خواردنەوەی خواردنەوە کحولییەکان و خواردنی گۆشتی بەراز حەرامە. یاخود زۆر خێرە مرۆڤ قسە و گفتوگۆی خۆش لەگەڵ خێزانەکەیدا بکات، ڕەنگە ئەمە حوکمی سەدەقەشی هەبێت، بەڵام قسەی پاشەملە و غەیبەتکردنی وەك خواردنی گۆشتی براکەی وایە بە مردوویی. هەر بەو جۆرە تەماشاکردنی زۆرێك لە جوانییەکان دەبێتە مایەی خێر و پاداشتە و ڕوانین بۆ دیمەنە حەرامەکانیش قەدەغەکراوە. لەکاتێکدا لە قورئانی پیرۆزدا بەڕوونی ئەوە باسکراوە کە تەماشاکردنی کۆمەڵێك دیمەن گوناهە ئەگەرچی لە ڕووکەشدا

جوانیش بن، ئیدی کێ دەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات تەماشاکردنی وێنە و دیمەنە ڕووت و نابەجێکان خێر و چاکەن؟ ئایا دەکرێت شتێك لە هەمان کاتدا هەم خێر و هەم گوناهیش بێت؟ مادەم حەرامبوونی ئەمە ڕوون و ئاشکرا لە قورئان و فەرموودەکاندا دیاریکراوە، هەوڵدان بۆ بەحەلاڵنیشاندانی کردەوەیەکی قەدەغەکراو بە پشتبەستن بە ڕاستی خێربوونی تەماشاکردنی جوانی، هەڵەیەکی زۆر گەورەیە. خوا پەنامان بدات هەژمارکردنی حەرام بە حەلاڵ و بگرە بە پاداشتیش، ڕێگایەکە دەچێتەوە سەر کوفر.

بەڵێ لەبەر ئەوەی ڕوانین بۆ جوانییەکانی دروستکراوی دەستی پەروەردگار و تەماشاکردنی ڕۆحلەبەرە جوانەکان دەبێتە هۆکارێك بۆ تێفکرینی مرۆڤ، بۆیە خێر و پاداشتە. جوانی واتە ئەو جوانییانەی ڕێپێدراو و سروشتین. هەموو دروستکراوێك بەدڵنیاییەوە سەرەنجام جوانە. تەماشاکردن و تێفکرینی لەو جۆرە هەم پاداشت و هەم توانستی زانین و خۆشویستنی بەدیهێنەر دەست مرۆڤ دەخات. سنووری ئەم جوانییانەش بەپێی ئایینەکەمان کێشراوە. لەبەر ئەوەی لە دونیای تاقیکردنەوەداین پێویستە لەسەرمان کە لەنێو بازنەی ڕێپێدراوەکاندا بمێنینەوە. دەبێت ئەوەش لە یاد نەکەین کە بازنەی ڕێپێدراوەکان بۆ کەیفمان کافییە، پێویست بە چوونەدەرەوە ناکات.

باشە، زۆرێك لە مرۆڤە ئیماندارەکان سەرەڕای زانینی باشە و خراپە، بۆچی ناتوانن چاوەکانیان لە حەرام بگێڕنەوە؟

لە قورئانی پیرۆزدا و لە سەرەتای ئەو ئایەتەدا کە باسی پاراستنی چاوەکان دەکات لە حەرام، خوای گەورە دەفەرمووێت "بە پیاوە ئیماندارەکان بڵێ و بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ". کاتێك لەم ڕوانگەیەوە تەماشا دەکەین

گەر بڵێین پارێزگاری نەكردن لە چاوەكان لەبەرامبەر حەرامدا لاوازیی ئیمان دەردەخات، هەڵە نابێت. بە دەربڕینێكی تر، پاراستنی چاوەكان بەرامبەر بە حەرام تەنها كاری ئیماندارانە و ئیماندارانیش دەتوانن بە ئەندازەی پلەی ئیمانەكەیان لەم بابەتەدا سەركەوتن بەدەست بهێنن. مەگەر سەرچاوەی زۆرێك لە كێشەكانی ئەمڕۆمان ناگەڕێتەوە بۆ لاوازیی ئیمان؟

بەڵێ، مرۆڤ تەنها لە ڕێگەی هێزی ئیمانەوە دەتوانێت پابەندی ئەم فەرمانەی پەروەردگاری بێت. ئەو دۆخە لای هەمووان زانراوە كە مرۆڤە باوەڕلاوازەكان بە تەماشاكردنی حەرام تێی دەكەون، حاڵی ئەو كەسانە چەندە مایەی بەزەییە كە بەردەوامن لە تەماشاكردنی حەرام و بەمەش پاكیزەیی و عیززەتی خۆیان بەهەدەر دەدەن و، یەك لە بەنرخترین ئامێرەكانی جەستەشیان كە چاوە لەم ڕێیەدا لە ڕووی مەعنەوییەوە لەناو دەبەن.

بۆ ئەوەی نەكەوینە ئەم دۆخەوە پێویستە،

* دەرك بە بەها و نرخی چاوەكانمان بكەین،

* نرخ و بەهای گەیشتنی كۆتاییمان بە بەهەشت هەردەم لە یاددا بێت،

* چاوەكانمان بەدەر لە ڕێنماییەكانی پەروەردگاری مەزن بەكار نەهێنین،

* بۆ ئەوەی بەهایەكی لایەق بە بەهەشتی بەرین بەدەست بهێنین، پێویستە چاوەكانمان تەنها لە تەماشاكردنی ئەو جوانییانەدا بەكاربهێنین كە ڕێ پێدراون.

## فەرموودەیەکی ئازیزمان

ڕۆژێکیان بانگبێژی دووەمی ئازیزمان (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم دێتە ماڵی پێغەمبەری ئازیزمان بۆ گفتوگۆی پێغەمبەری ئازیز. کاتێك لە ژوورەوە گفتوگۆ دەستی پێ کرد عائیشەی دایکمان (رضيَ اللهُ عَنها) فەرمووی "ئەی نێردراوی خوا! ڕێگەم دەدەن منیش لێرەدا گوێتان لێ بگرم؟" لە وەڵامدا ئازیزمان فەرمووی "نەخێر ئەی عائیشە، نابێت"، عائیشەش فەرمووی "بۆچی ئەی نێردراوی خوا؟ خۆ ئەو چاوەکانی نابینێت." ئازیزمان لە وەڵامدا ئەمەی فەرموو "**گەر ئەویش تۆ نەبینێت مەگەر تۆ ئەو نابینیت؟**"[1]

ئازیزمان بەم فەرمایشتەی نەك تەنها ڕوانینی پیاوان بۆ ئافرەتان، بەڵکو ڕوانینی ئافرەتان بۆ پیاوانیشی قەدەغەکردووە.

1. أبو داود، اللباس ٣٤؛ الترمذي، الأدب ٢٩.

# بۆچی دەبێت چاوەکانم لە حەرام بپارێزم؟

## ١. چاوەکانت بپارێزە، تا عەقڵت پارێزراوبێت

حەزرەتی جوبرەئیل (عَلَيْهِ السَّلَام) عەقڵ و شەرم و ئیمانی هێنایە خزمەت حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) و فەرمووی "ئەی ئادەم! خوای پەروەردگار سەلامت لێ دەکات. فەرمانی کرد یەکێك لەم سێ دیارییە وەربگریت کە هێناومە."

حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) فەرمووی "لەم سێ دیارییەدا عەقڵ هەڵدەبژێرم." و عەقڵی وەرگرت. لەسەر ئەمە حەزرەتی جوبرەئیل (عَلَيْهِ السَّلَام) بە ئیمان و حەیای فەرموو "ئێوە دەتوانن بڕۆن." ئیمان وتی "خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردم عەقڵ لە کوێ بوو منیش لەوێ بم! لەبەر ئەوە من ناتوانم لە عەقڵ دابڕێم و بڕۆم!" حەیاش وتی "خوای پەروەردگار هەمان فەرمانی بە منیش کرد، منیش ناتوانم لە عەقڵ جودا ببمەوە و بڕۆم." خوای گەورە زیرەکی بەخشیبێت بە کێ، حەیا و ئیمانیش لەگەڵ ئەودا دەبێت. ئەوەی عەقڵی نەبێت نە حەیای دەبێت نە ئیمان.

### بەکارهێنانی توانستی مێشک بە شێوازێکی دروست.

جەنابی حەق دەمارەشانەکان و خانەکانی کردووەتە هۆکار بۆ بارکردنی زانیارییەکی ئێجگار زۆر. ئەو کەسانەی توانستی مێشکیان لە شوێنی خۆیدا

بەكاردەهێنن و دەزانن چۆن سوودی لێوەربگرن، دەتوانن لە ماوەیەكی زۆر كەمدا هەموو ئەو شتانە فێرببن كە بینیویانە یان خوێندویانەتەوە، دەشێت سەرەڕای تێپەڕبوونی كاتیش لەبیریان نەچێتەوە. لەم سەردەمەدا تێبینیی ئەوە دەكەین كە توانستی مێشكی مرۆڤەكان بە بەراورد لەگەڵ توانستی مێشكی سەردەمی هاوەڵانی بەڕێز، لاوازبوونێكی بەرچاوی بە خۆوە بینیوە، ڕوونكردنەوەی ئەم دۆخە تەنها لە ڕووی سیستەمی پەروەردەوە بەس نییە. زانایانی پێشین كە لەمەڕ تەندروستیی مێشكدا هەستیارییەكی لە ڕادە بەدەریان هەبووە، بەئاگابوون لە جۆری خۆراك و، ڕاگرتنی هاوسەنگیی شەكر و، دووركەوتنەوە لە ترشی و، خواردنی نانی بەیانی و، بە ڕەچاوكردنی زۆر نەخواردن، بەپێی توانا هەوڵدان بۆ لەدەستنەدانی ژەمەكان، لەو تایبەتمەندییانەن كە جێی بایەخی ئەوان بوون.

وەك گەشەكردنی ماسولكەكان لەگەڵ بەكارهێنانیاندا، مێشكیش لەگەڵ بەگەڕخستنێكی تەندروستدا گەشە دەكات، ئەم ڕاستییە لە مێژە لای هەمووان زانراوە. مێشك بە دووبارەكردنەوەی وشە نوورانییەكانی وەك لەبەركردنی قورئان و یادی خوا و تەسبیحاتی ئەودا هەم بەهێز دەبێت و هەم شوێنە تاریكەكانی ڕووناك دەبنەوە، بە وازهێنانیش لەمانە پەككەوتن و تەنانەت پاشكەوتن بە خۆوە دەبینێت. لەپێناو پەكنەكەوتنی فرمانەكانی مێشكدا، ئاماژە بەم تایبەتمەندییانەكراوە:

- پێویستی دووركەوتنەوە لە خەوی زۆر وەك هۆكارێك بۆ تەمبەڵبوونی مێشك.

- دوور كەوتنەوە لە زۆرخۆری و پڕی گەدە، كە فاكتەرێكی كاریگەری نەرێنییە لەسەر مێشك.

- خەوتنی کاتی کەراهەتی بەیانیان و تەماشاکردنی حەرام دەبنە هۆی لەبیرچوونەوە.

## مەترسیدارترینی ئەو هۆکارانەی مێشکی مرۆڤ لاواز دەکەن

مەترسیدارترین هۆکار بۆ لاوازیی مێشك ئەو هۆکارانەن کە هەستە شەهوانییەکان دەوروژێنن و لایەنە ئاژەڵییەکانی مرۆڤ دێننە جۆش. ئەمڕۆ ژینگەی خێزان و کۆمەڵگە لەمەڕ پەروەردەی باشی گەنجاندا دەستەوسانە و ئەو تەوژمانەش کە لە هەرچوار لاوە دێن ڕۆحەکان دەکەنە ئامانج بیر و عەقڵیش ئیفلیج دەکەن. بەرنامەکانی تەلەفزیۆن، لاپەڕەکانی ئینتەرنێت، یارییە ڤیدیۆییەکان، هەواڵەکانی ڕۆژانە و ململانێ سیاسییەکان، هەڵسوکەوت و ژیانی هونەرمەند و یاریزانەکان کە وەك ڕووداوی گرنگ نیشان دەدرێن و دەگوازرێنەوە، ئەو درۆیانەی کە بە مەبەستی دروستکردنی مەراق لای خەڵکی هەڵدەبەسترێن، ساختەکاری و هەڵخەڵەتاندن و چاوبەست. هەموو ئەمانە دەماخە ماندووەکانی مرۆڤی ئەمڕۆیان داگیرکردووە. ئەو هەموو پیسییەش کە ڕۆژانە دەخرێتە زیهنی مرۆڤەکانەوە، کاتێك هەستە ئاژەڵییەکان دەوروژێنرێن و وەك چەکوشێك دەدەن بەسەر هەستە بەرز و باڵاکاندا، ئیدی حەز و ئارەزووە شەهوانییەکان دەرفەتی خوێندن و فێربوون و تێفکرین نادەنە نەوەی داماوی ئەم چاخەمان و، بەمەش توانستی مێشکیان بەرەو کەمبوونەوە دەڕوات. بەڵێ، بەداخەوە، مرۆڤی سەردەمەکەمان لەنێوان شەپۆلی کوشندەی گوناهەکانی وەك گوێگرتن لە حەرام و قسەکردنی حەرام و ڕوانینی حەرامدا دێت و دەچێت.[1]

---

١. م. فەتحوڵلا کولەن، ئیکسیری نەمری، ١٢٦.

## ڕوانینی حەرام و لەبیرچوونەوە

"تەماشاكردنی حەرام دەبێتە هۆكار بۆ لەبیرچوونەوە" هەر بۆیە لە بابەتی تەندروستیی مێشكدا جەختێكی زۆر لەسەر ئەم بابەتە دەكرێتەوە. تێدەگەین ئەو پەیوەندییەی بە حەرامەوە هەیەتی بریتییە لەوەی كە حەرام شان بە شانی ئەو ڕەشبوونەی بەسەر دڵدا دێت، ڕەنگە ببێتە هۆكار بۆ ڕەشبوونی مێشكیش. دیمەنە حەرامەكان وەك چەند كونێكی ڕەش زۆربەی زانیاری و دیمەنەكانی ناو مێشك بەرەو زوڵوماتی خۆیان كێش دەكەن و ئەوانەی تریشیان لەژێر سێبەری تاریكییاندا دەهێڵنەوە، وەك كۆمەڵە ڤایرۆسێك كاركردنی مێشك تێك دەدەن و، بە وێرانكارییەكانیان ڕێگە نادەن بگەینە زۆرێك لە دۆسیە بەنرخەكانی ناو مێشكمان.

گەر هەواڵی دەركردنی قورئان لە سنگی حافزەكان لە ئاخرزەماندا[1] لەم چوارچێوەیەدا لێكبدرێتەوە بۆچوونێكی گونجاو دەبێت. مێشكی مرۆڤ كە وەك كارتێكی میمۆری هەموو شتێكی بینراو و بیستراو تۆمار دەكات، دەتوانێت تا ڕۆژی لێپرسینەوە سەرجەم ئەو تۆمارانە بشارێتەوە كە شایەتی لەسەر خۆی دەدەن و لە كاتی پێویستیشدا پێیان بگاتەوە. كاتێك لە ڕۆژی دواییدا سەرجەم كردەوەكانی مرۆڤ نیشانی خۆی دەدرێنەوە، ئەو كات نیشاندانی دیمەنەكانی نێو كارتەكەش شتێكی هیچ سەیر نابێت.

گەر دۆسیەكان نەشسڕێنەوە لە ئەنجامی لاوازیی بیردا دەستپێگەیشتنیان زەحمەت دەبێت و لە ئاكامدا دیاردەی لەبیرچوونەوە دێتە كایەوە. تێكچوونێك

---

١. عبدالرزاق، المصنف ٣٦٢/٣؛ الطبراني، المعجم الكبير ١٤١/٩؛ الديلمي، المسند ٤٨٨/٥؛ المعزي، تحزيب الكمال ٤٠٣/١٢.

لە توانستی بیرهاتنەوە و بیرهێنانەوەی مێشکدا بە کاریگەریی ئارەزوو و ویستەکان و لەژێر پاڵەپەستۆی دیمەنە حەرامەکاندا دێتە کایەوە و لەبیرچوونەوە شێوەی نەخۆشییەکی زیهنی وەردەگرێت. دیمەنە حەرامەکان لە مێشکدا بە ئاڕاستەی ویستە جەستەییەکان بەپێی ڕیزبەندییەکی تێکەڵاو بەڵام دیاریکراو، پێکهاتەی ڕێکخراوی دۆسیەکان تێکدەدەن، بەم شێوەیە ئەو پاشاگەردانییەی لە مێشکی گیرۆدەی لێشاوەکانی زانیاریی پێویست و ناپێویستدا دێتە ئاراوە، کارەکە دەگەیەنێت بە دۆخێك کە دەرچوون لێی مەحاڵە.

با بابەتەکەمان بەم هەڵسەنگاندنانەی مامۆستا فەتحوڵڵا گولەن کۆتایی پێ بهێنین:

"ئەهلی خوا لە بابەتی نەزەر وەك هۆکاری لەبیرچوونەوە زۆر جەختیان کردووەتەوە. ئەوەیان خستووەتە ڕوو کە ئەو مرۆڤەی ناتوانێت بەسەر چاوەکانیدا زاڵ بێت و بەردەوام تەماشای ئەو دیمەنانە دەکات کە هەستە شەهوانییەکان بەر قامچی دەدەن، وردە وردە توانستی مێشکی کوێر دەبێتەوە." لەڕاستیدا کاتێك ئیمامی شافیعی شکاتی لاوازیی لەبەرکردنی خۆی دەباتە لای مامۆستاکەی کە وەکیعی کوڕی جەڕڕاحە، ئەو زاتە گەورەیە ڕێنوێنی ئیمامی شافیعی دەکات تا خۆی لە بچوکترین گوناه بەدوور بگرێت و پێی دەڵێت "زانست نوورێکی خوای گەورەیە، خوای پەروەردگار ئەو نوورە نابەخشێت بەوانەی کە بەردەوام لە گوناهدان." ڕەنگە ئیمامی شافیعی دەقێکی لەبری یەك جار، بە دوو یان سێ جار لەبەرکردبێت بۆیە ئەم سکاڵایەی کردبێت. لە لایەکی تریشەوە ئەوە بە خەیاڵی مرۆڤدا نایەت ڕۆحێکی پاکی وەك ئیمامی شافیعی بەئەنقەست کەوتبێتە گوناهەوە.[1]

١. م. فەتحوڵڵا گولەن، ئیکسیری ئەمری، ١٢٧-١٢٦.

## گەردگرتنی مێشک و پەککەوتنی زیرەکی

وەك دەزانین ئەو بۆشاییەی کە وێنەیەك لە کۆمپیوتەرێکدا داگیری دەکات ڕەنگە هێندەی ئەو بۆشاییە بێت کە چەند بەرگێك کتێب داگیری دەکات. بەم مانایە، ئەو منداڵەی هەموو ئەو شتە نوێیانە لە مێشکیدا تۆمار دەکات کە لە تەلەفزیۆندا دەیانبینێت، ڕەنگە لە ساڵەکانی ناوەڕاستی فێربوونیدا لە وانە بنەڕەتییەکانی وەك بیرکاری کە زیرەکیی پاراوی دەوێت یان وانەکانی زمان و ئەدەب کە قوڵبوونەوەی پێویستی دەوێت، پەککەوتن لە ئاستی زیرەکیی ئەو منداڵەدا بەدی بکرێت. هۆکاری ئەمەش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئەم مێشکە نوێیانە لە لایەن دایکانیانەوە لەپێناو خواردنپێداندا لە بەردەم ڕیکلامەکانی تەلەفزیۆندا خەواندنی موگناتیسییان بۆ دەکرێت و، مێشك و بیری منداڵی داماویش لەژێر هێرشی چەندین داتای پچڕ پچڕی بینراودا وەك تەنەکەیەکی زبڵی لێدێت. ئەم ماوەیە کە لە تەمەنەکانی دواتریدا بە فیلمکارتۆن و زنجیرە دراماکان بەردەوام دەبێت، کاتێك لە تافی هەرزەکاریدا تەماشاکردنی دیمەنە بەدڕەوشتییەکان دەست پێ دەکات، ئیدی کێشەکانی تێگەیشتن هاوشان لەگەڵ کێشە بێچارەکانی وەك زووبێزاربوون و نەبوونی توانای سەرقاڵبوون و تێگەیشتن سەرهەڵدەدەن.

گەنجان لەبەردەم شاشەکاندا وەك تەماشاکەر لە کەسایەتییەکی دەرخەری چالاکەوە وەردەچەرخێن بۆ کەسایەتی دەرخەر و بڕیاردەری پەککەوتوو. ئەمە لە لایەکەوە بوەستێت، لە ئەنجامی دارِمانی لایەنە ناسکەکانی عەقڵدا وەك بیر و خەیاڵ و وێناکردن، وایان لێدێت نەتوانن لە هیچ بوارێکدا دوورییەکی ئەرێنی ببڕن. لەگەڵ ئەمەشدا لە ئەنجامی ئەو میکانیزمی ئیسرافەدا کە دیمەنە حەرامەکان لە لەشدا بەگەڕی دەخەن، هێزی جەستە لەخۆڕا بەفیڕۆ

دەدرێت و، دواجار کێشەکانی سەرنج و وەرگرتن و وردبوونەوە دێنە کایەوە. وێرانکارییە دەروونییەکانی لە لایەک بوەستێت، کاریگەریی نەرێنی ڕوانینی حەرام لەسەر جەستە و هۆکاربوونی بۆ جەنجاڵی مێشک، کێشەی گەشەی عەقڵی و تەرکیزکردن لەو مرۆڤەدا دەهێنێتە مەیدان.

## قارەمانانی بیر و هۆش و پەروەردەی ئەمڕۆ

کاتێك لە دۆستانی پێشینی خوا دەڕوانین، دەبینین کەسایەتییەکی وەك حەزرەتی ئەبو هورەیرە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بەبێ ئەوەی پێویستی بە دووبارەبیستنەوەی شتێك هەبێت لەبەری کردووە. زەیدی کوڕی سابیت (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لەسەر فەرمانی ئازیزمان لە ماوەی پازدە بۆ بیست ڕۆژدا تا ئاستی نامەنووسین و وەرگێڕانی نامە هاتووەکان زمانی عیبری فێربووە. ئەمانە و سەدان هاوەڵی تری بەڕێزیش کە کەسانێك بوون بە یەك جار شتانی بیستراو فێربوون و، ئەوەشی کە فێری بوون جارێکی تر لەیادیان نەکردووە. بەتایبەت سەردەمی شوێنکەوتووان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان پڕە لەو کەسانەی بەڕاستی مافی توانستی مێشکیان داوە. بۆ نمونە، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل سەرەڕای هاوتابوونی ناوەڕۆکیان یەك ملیۆن فەرموودەی بە سەحیح و حەسەن و لاوازەوە لەبەرکردووە کە بە سەنەد و مەتنی جیاجیاوە گوازراونەتەوە، بەم جۆرە موسنەدە بەناوبانگە چل هەزار فەرموودەییەکەی هێنایە کایەوە کە لە نێو سێسەد هەزار فەرموودەدا گوڵبژێری کردبوون.

گەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە هۆکاری قەدەغەکردنی خوێندنەوەی نووسینی سەر گۆڕەکان لە قوتابیانی حوجرە و قوتابیانی لەبەرکردنی قورئان

ڕێگرتنە لە پڕبوونی مێشک بە شتانی ناپێویست، ئیدی دەتوانین مەزەندەی ئەوە بکەین گەنجی ئەمڕۆ لەوپەڕی مارکە و، تابلۆ و، ژمارەی تەلەفۆنەکاندا و لەنێو کەمەربەندی پێنج شەش خولەکی ڕیکلامێکدا دووچاری چ جۆرە پیسبوونێکی مێشک دەبێت. گەر ئەمڕۆ لە بواری فیقهدا "موجتەهید" و لە بواری فەرموودەدا "موحەددیس"مان نەبێت ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە هۆکارەکەی بۆ کاریگەریی زیری ئەم زەمان و زەمینەیە دەگەڕێتەوە کە هەر لە منداڵییەوە دژ بە فرمانە زیهنییەکانی مرۆڤ کاردەکات. لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا بلیمەتی وا هەبووە فەرهەنگی لەبەرکردووە، توانیویەتی بەرهەمی هەشتا بەرگی لەبەربکات، بەڵام لەمڕۆدا چیرۆکی ئەو کەسانە وەك ئەفسانە دەگێڕێنەوە. کەمیی زیهنی کارا و پاراو وای کردووە لە دونیای ئەمڕۆماندا بەدەست کەمی مرۆڤی شایستەوە بناڵێنین.

لابردنی بەهێزکردنی توانستی مێشك لە سیستەمی پەروەردەدا بە ناوی "فێرکاریی پشتبەستوو بە لەبەرکردن"ەوە، مایەی تێگەیشتن نییە. ئەوەی پێی دەوترێت مێشکی کۆپی و لەبەرکردن، گەر لە ڕوانگەی بەهێزییەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازیش بێت، هەڵەیەکی گەورەیە لەبەرکردن لە سیستەمی پەروەردە دەربکرێت بە بیانوی ئەوەی تێگەیشتن لەبەرکردن ئاسان دەکات. چونکە تێگەیشتن و لەبەرکردن جێگرەوەی یەکتر نین، بەڵکو تایبەتمەندیی دوو یەکەی جیاوازن کە زۆر پەیوەندیداری یەکترن و فرمانەکانی کردار و عەمبارکردنی بیری مرۆڤ جێبەجێ دەکەن. لەکاتێکدا بە پێکەوەبوون و کارکردنی تەندروستی هەردووکیان زیرەکیی مرۆڤ لە ڕوانگەی زانستەوە دەرەنجامێکی سوودبەخش دەدات بە دەستەوە، لەو زیرەکییانەدا چاوەڕێی دەرەنجامی ڕۆشن ناکرێت کە یەکێکیان زۆر لەپێشە و ئەوی تریان دواکەوتووە.

## پەروەردەی ئایینی و پاراستنی عەقڵ

لەمڕۆدا بۆ پارێزگاریکردن لە تەندروستیی عەقڵ پێویست دەکات مرۆڤ لە چوارچێوەی پاکیزەییدا بمێنێتەوە کە ئایینیش داخوازیەتی. پاکیزەیی و ناموسیش بە نزیکنەبوونەوە لە حەرام و پاراستنی هێڵی تەماشانەکردن دێتە دی. پێغەمبەری ئازیز (صَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ) لە بابەتی لەحەرامنەڕوانینی ئوممەتەکەیدا تا بڵێیت هەستیار بووە، لە وەرزی حەجدا کە هەمووان بە ژن و پیاوەوە تەواو پابەندی عیففەت بوون، لەکاتێکدا کە ئەرکی حەجیان بەجێهێنابوو و لە عەرەفات دەگەڕانەوە، فازڵی کوڕی حەزرەتی عەبباس لەسەر زینەکەی ئازیزمان بوو. ئازیزمان سەری فازڵی بەرەو ڕاست و چەپ دەسووڕاند و یارمەتیی دەدا تا چاوی نەکەوێتە سەر ئافرەتانی ئەملا و ئەولای. دەبینین سەردەمەکە سەدەی بەختەوەرییە، وەرزەکە وەرزی حەجە، زین زینی پێغەمبەری خوایە و ئەو کەسەش کە سەری بۆ ڕاست و چەپ دەسووڕێنرێت بۆ نەزەرنەکردن، حەزرەتی فازڵە کە کەس گومانی لە پاکیزەیی نییە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم ڕاستییانە هەستیاریی بابەتەکە وا دەخوازێت ئازیزمان خۆی جەخت لەسەر گرنگییەکەی بکاتەوە. تەنانەت لە دۆخێکدا کە گومان لە مەحاڵبوونی شتێکی وەهادا نییە، لەپێناوی ئەوەی خەیاڵی تر نەچێتە نیگایەوە و تیرێکی سەرکێش دڵی کون نەکات، سووڕاندنی سەری فازڵ لەملا بۆ ئەولا، تابلۆیەکی پڕ عیبرەت لە ڕوانگەی هەستیاریی پێغەمبەری ئازیزەوە بۆ ئەم بابەتە وێنا دەکات.[1] بەڵێ، تەنانەت لەمڕۆشدا کاتێك دەچینە مزگەوتێکەوە یان کە دەچینە خزمەت کۆمەڵێك کەسانی نوورانی، بەبیرداهاتنی شتی وەها مەحاڵە، کە وایە چۆن هەڵسەنگاندن بۆ

١. م. فەتحوڵڵا گولەن، گۆزەی شکاو ٧، ئیکسیری ئەمری، ١٢٧.

ئەوە دەكەین كە ئازیزمان لەو كاتەدا سەری فازڵی بەملاولادا سووڕاندووە تا خەیاڵی تر نەچێتە نیگایەوە و، تیرێكی سەركێش دڵی كون نەكات و، تۆوی فسق و فجور دزە نەكاتە نێو ناخیەوە؟

ئەو مانایەی ئەم ڕووداوە گوزارشتی لێدەكات بریتییە لەمە: وەك ئەوەی لەپێناو نەسووتانی دارستانەكەدا تەنانەت ڕێگە بە زیلكەی شقارتەش نەدرێت، وەك ئەوەی سەرەڕای نەبوونی هیچ ئەگەرێكی جەنگ، هێشتاش لەنێو سەربازگەیەكی هەزاران سەربازیدا نۆبەت بەجوانی بەڕێوە بچێت و بۆ چركەیەكیش چاو دانەخرێت... بەڵێ، هەڵگرتنی سەرجەمی ئەو هۆكارانەی مرۆڤ بەرەو حەرام و، بەدڕەوشتی و، دەستدرێژی و، تاوان و چەندین شتی تر دەبەن... گرتنی هەموو كون و كەلەبەرەكان نەوەك ڕۆژێك لە ڕۆژان مار و دووپشك زەفەر بهێنێت... بنیاتنانی بەربەستی پتەو و پۆڵاین لەبەردەم شێوانی چەندین ژیان و داڕمانی چەندین ماڵ و حاڵ بە بۆنەی ڕوانینێك، خەندەیەك یان دەستلێدانێكەوە.. واتە ڕێگریی بنچینەیی لە گوناه و نەهێشتنی ئەو هۆكارانەی دەماندەنە بەر بۆ خراپە، ئەمە ئەو ڕێگایەیە كە خوا نەخشەكەیی كێشاوە![1]

بەڵێ، هەر كە یەكەم جار مێشك بە ڕووی پیسیدا دەرگای واڵاكرد و سنوورەكانی تێپەڕاند و، لەو بابەتەدا كەمتەرخەمیی نواند، ئیدی خۆڕێكخستنەوە و بەدەستهێنانەوەی تەندروستیی مێشك و هاتنەوە بۆ سەر ڕاستەڕێ كارێكی ئاسان نابێت و پێویستی بە هەوڵێكی زۆر جددی دەبێت، بەدەستهێنانەوەی ئەو وزەیەش كە بەهەدەردراوە بە هەمان پاراویی ڕاستەقینەی كاتی خۆی كارێكی مەحاڵ دەبێت. "حوججەتول ئیسلام" حەزرەتی ئیمامی غەزالی لە زمانی عابیدێكی بەناوبانگی شاری بەسرەوە كە ناوی ئەبو نەسرە، بەم شێوەیە باس لەم

[1]. م. فەتحوڵڵا كولەن، لە سێبەری باوەڕدا-٢، بابەتە ئاسۆییەكان، ٢١٦.

دەردە دەکات "چاو مەخەرە سەر جەستەی ئافرەت و سەرنجی مەدە. چونکە نەزەر تۆوی شەهوەت لە دڵدا دەچێنێت. لە کاتێکی وەهادا باشترین شت ئەوەیە مرۆڤ بۆ نەفسی خۆی بچەسپێنێت کە تەماشاکردنێکی چەندبارەی وەها خودی جەهالەتە. چونکە گەر تەماشابکات و جوان بێت، شەهوەتی دەجولێنێت. بەڵام دەستەوسانە لەبەردەم ئەو جوانییەدا و ناتوانێت پێی بگات. لەبەر ئەوە لە حەسرەت و دڵتەنگی زیاتری بۆ نامێنێتەوە. گەر بە لایەوە ناشرین بێت چێژ وەرناگرێت و ڕەنگە تووشی سزاش ببێت. لە هەردوو دۆخەکەدا لە سزا و حەسرەت بەولاوە هیچی تر جگە لەم گوناهە بەدەست ناخرێت."

دواجار ئەوەی پێویستە بوترێت ئەوەیە، ئەو کەسەی چاوی ناپارێزێت، ئەستەمە بتوانێت پارێزگاری لە تەندروستیی بیر و مێشکی بکات. بە پێی ئەنجامی هەزاران ئەزموون بۆمان دەردەکەوێت کە، ئەو دیمەنە تاریکانەی کە لە ڕێگەی چاوەوە بەبێ ڤیزە و وشەی نهێنی داخڵدەبن، بە جۆرێك لە جۆرەکان لە مێشکدا تۆمار دەبن و دونیای دڵ و ڕۆح و دەماری ئەو کەسە ڕەشدەکەن.

### لەمەڕ نەخۆشی لەبیرچوونەوە

جارێکیان یەکێك لە قوتابییەکانی بەدیعوززەمان کە حافزقورئانێکی گەنج دەبێت، لە مامۆستا دەپرسێت "هەست دەکەم نەخۆشیی لەبیرچوونەوە لە مندا پەرە دەسێنێت، دەبێت چی بکەم؟" مامۆستاش لە وەڵامدا دەڵێت "تا بکرێت تەماشای نامەحرەم مەکە، چونکە وەك ئیمامی شافیعی دەفەرمووێت، نەزەری حەرام هۆکاری لەبیرچوونەوەیە."

مامۆستا سەعید دەربارەی ئەم بابەتە بەم جۆرە باسی یادگارییەکانیمان بۆ دەکات:

پێش پەنجا و پێنج ساڵ، بۆ ماوەی دوو ساڵ لەسەر پێداگریی خۆی لە ماڵی پارێزگاری بەدلیس خوا لێی خۆشبێت عومەر پاشادا مامەوە. زۆر حورمەتی زانستی لە لا بوو. شەش دانە کچی هەبوو، سیانیان گەورە و، سیانیان بچوك. من سەرەڕای مانەوەی دوو ساڵمان لە هەمان ماڵدا، سیانە گەورەکەیانم لێك جودا نەدەکردەوە و باشم نەدەناسینەوە. چونکە هیچ دیقەتم نەدابوون و تەماشام نەکردبوون تا بزانم. پێیان وتم "بۆ تەماشا ناکەیت؟"

وتم "پارێزگاریکردن لە عیززەتی زانست ناهێڵێت تەماشا بکەم."

دیسان لە یەکێك لەو ڕۆژانەدا کە لە ئیستانبوڵ بووم، لە ناوچەی کاغیتخانەی ئەو شارەدا فیستیڤاڵ سازدەکرا. کاتێك پێکەوە لەگەڵ هەردوو خوالێخۆشبوو بریکار مەلا سەید تەها و سەید حاجی ئەلیاسدا بە بەلەم بەرەو کاغیتخانە دەڕۆیشتین، لە هەردوو لای خەلیجدا هەزاران ئافرەت و کچی کراوەپۆشی ڕۆم و ئەرمەنی و ئیستانبوڵی هەبوو. لە پاڵ ئەو ئافرەتانەوە ڕەت دەبووین. بە درێژایی ئەو گەشتە یەك کاژێرییە، مەلا تەها و حاجی ئەلیاس بە سەرە چاویان لەسەر من بووە. بەبێ ئەوەی خۆم ئاگام لێبێت. لە کۆتایی گەشتەکەدا وتیان:

"زۆر سەرسامبووین بەم حاڵەی تۆ، هیچ تەماشات نەکرد."

وتم "لەبەر ئەوەی عاقیبەتی چێژە ناپێویست و کاتی و پڕگوناهەکان سزا و پەژارەیە، نامەوێت."

بەڵێ، تەماشاکردنی حەرام لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکاندا قەدەغەکراوە. مادەم هەموو چێژێکی دونیا کاتییە. بۆیە نابێت مرۆڤ لەپێناو چێژێکی کەم و کورتخایەنی دونیادا، دونیای دوارۆژی بەهەدەر بدات کە تیایدا بە چێژە بێکۆتا و ئەبەدییەکانی شەرەفمەند دەبێت.

## ٢. چاوت بپارێزە، با تەندروستیت پارێزراو بێت.

﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾ (النور: ٣٠)

"ئەی پێغەمبەر بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن لە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم، هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکترو پوختترە بۆیان (بۆ دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ڕۆح و لاشەیان) بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵس و کەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن."

﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ ﴾ (الفجر: ١٤)

"بەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەمیشە و بەردەوام ئامادەیە کە تۆڵە لە ستەمکاران بسێنێت."

### کێشەکانی زووباڵغبوون

لە گەنجی ئەمڕۆدا کە لە تەمەنێکی زۆر زوودا بەرامبەر ڕەگەزی بەرامبەریان بەخەبەر دێن، کێشەی زووباڵغبوون سەرهەڵدەدات. وەك گوڵی فریوخواردووی دەستی خۆری مانگی ئازار، ئەو گەنجانەی کە بەر لە بەدەستهێنانی پێگەیشتوویی پێویستی عەقڵی و بە زووبەئاگاهاتن و پێشوەخت دەچنە نێو چاخی باڵغبوون و هەرزەکارییەوە، بەهۆی نەبوونی توانایان بۆ کۆنترۆڵکردنی ویستەکانی عەقڵ و ژیرییان دووچاری چەندین گرفت دەبن. لەو تافەدا کە خوێنیان شێتانە بە جەستەیاندا دێت و دەچێت، ئەو گەنجانەی بەبێ بیرکردنەوە لە داهاتوو هەڵسوکەوت دەکەن، لە هەموو کەس زیاتر ئەگەری ئەوەیان هەیە بکەونە نێو کۆمەڵە کردەوەیەکی وەهاوە ژیانیان سەرلەبەر ڕەش بکات. ئەو گەنجانەی ناسنامەیان بە ئاڕاستەی

خۆشەویستی و ترسی خوا شكڵ و شێوەی وەرنەگرتووە، زۆر جار ڕەفتاری بێباكانەیان سەرەنجامی دژوار لە ژیانیاندا دێنێتە كایەوە. وەرگرتنی مەیدانی دایك و باوك لە لایەن منداڵەوە و، چەوساندنەوەی منداڵ و، دانانی منداڵ لە خانەكانی منداڵاندا بەهۆی نەبوونی توانای چاودێریكردنیەوە، تەنها چەند دانەیەكن لەو كێشانەی لە دونیای مۆدێرندا سەرهەڵدەدات.

ئەمڕۆ ئاشنابوونی پێشوەختی گەنجان بە پەیوەندیی زایەندی[1] و بە شێوەیەكی ناتەندروست بەداخەوە بەتەواوی لە دەستی دایك و باوكانیشدا نەماوە. گەنجان لەبەردەم ئەو شاشانەدا كە ئیرادەكان ئیفلیج دەكات، هەر لە ڕیكلامەوە تا فیلم و بە كاریگەریی زۆرێك لە بەرنامەكان لە كاتێكی زۆر زوودا شەهوەتیان بەخەبەر دێت. گەر بەدەر لە شەهوەتیش بیری لێ بكەینەوە دەبینین چ پڕبوونی زووی مێشك و چ وەرگرتنی زانیاریی ڕواڵەتیی پشتبەستوو بە بینین وا دەكەن فێربوونی بنچینەیی پەكی بكەوێت و بەم جۆرە و لە زۆر لایەنی تریشەوە تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت دەبنە مایەی زیان بۆ زۆرێك لە گەنجان، بەداخەوە چاودێری و كۆنترۆڵی دایك و باوكانیش بۆ ئەمە ڕۆژ بە ڕۆژ كاریگەریی خۆی لەدەست دەدات. دەكرێت تێكشكانی هۆشی ڕاستەقینەی گەنجێتی و نیشاندانی بەرسڤ و كاردانەوەی هاوشێوەی نێو هەواڵ و فیلم یاخود گەمە كۆمپیوتەرییەكان بە یەكێك لەم كاریگەرییە تێكشكێنەرانە هەژمار بكرێت.

ئەو تۆوانەی لە تەمەنێكی زۆر زوودا بە ناوی گوناهەوە لە كێڵگەی بیر و خەیاڵدا دەچێنرێن، لە تەمەنەكانی دواتری ئەو كەسەدا دەست دەكەن بەوەی میوەی فیسق و نیفاق و شیرك و كوفر بدەن و، ڕێگاكانی نێوان مرۆڤ و ڕاستی

---

[1]. پەیوەندیی زایەندی: مەبەست لە پەیوەندیی ژن و مێردایەتیی پیاو و ژنە.

یان دەبڕنەوە یان ڕەشی دەکەن یانیش دەیخەنە حاڵێکەوە لێدەرچوونی مەحاڵ بێت. بەتایبەتیش ئەو دیمەنانەی بەدڕەوشتییان لە خۆ گرتووە، بە تێپەڕینی کات هەموو توانای بیرکردنەوەی کەسەکە دەخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە، وەك کونێکی ڕەش سەرجەمی فرمانە عەقڵییەکان یان لەژێر کاریگەریی خۆیاندا دەهێڵنەوە، یانیش لە ئامانجە سەرەکییەکەیان دایان دەبڕن.

گەر دایك و باوکان پێش تافی باڵغبوون زانیارییە بنچینەییەکان لەسەر پەیوەندییە زایەندییەکان بە شێوازێکی ڕێکوپێك فێری منداڵەکانیان بکەن و، لەگەڵ ئەمەشدا لە نێو خێزاندا بەجوانی وێنای هەڵوێستی ئیسلام لەمەڕ بابەتەکە بکەن و هەستیارانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، ئیدی ئەو هەڵانەی کەسێك لەم تەمەن و تافەدا بەهۆی سەرسامی و سەرلێشێوانەوە ئەنجامیان دەدات بێگومان دادەبەزێت بۆ کەمترین ڕادە. پێویستە ئەم قاڵبی ڕەفتارە پەروەردەییانە لە چوارچێوەیەکی گشتگیری ئەخلاقیدا دابنرێن و لە کەشێکی لەباردا لەگەڵ هاوتەمەن و هاوتاکانی خۆیدا تاقی بکرێنەوە. ئەمەش لە پێناو پارێزگاریکردن لە خاوێنیی زیهنی گەنجان لەمەڕ بابەتە زایەندییەکان[1] و، بەردەوامیدان بە ژیانیان وەك مرۆڤی خاوەنتوانستی عەقڵی تەندروست گرنگییەکی ئێجگار زۆری هەیە.

## زیانە تەندروستییەکان

شارەزایانی زانستی پزیشکی تێبینیی ئەوەیان کردووە کە ڕوانینی حەرام و ئەو زنجیرە بەفیڕۆدانە جەستەییەی لە ئەنجامیدا دەکرێت، لە گەنجاندا

---

١. ئەو بابەتانەی تایبەتن بە لایەنی جەستەیی پیاو و ئافرەتەوە.

ڕێگا بۆ کۆمەڵێك نەخۆشی سایکۆلۆژی خۆش دەکات وەك سەرقاڵی و، تەرکیزنەکردن و، نارسیزم (لەخۆڕازیبوون) یان پێچەوانەکەی وەك ئەوەی گەنجەکە ڕقی لە جەستەی خۆی ببێتەوە. توێژینەوەکان ئەوەیان خستووەتە ڕوو کە دیمەنە نائەخلاقییەکان بینەرەکانیان دەخەنە دۆخی کوێرییەکی کاتییەوە. دیمەنە نائەخلاقییەکان بۆ ساتێك پەیوەندیی مرۆڤ لەگەڵ دونیادا دادەبڕن. ئەمەش دۆزینەوەی توێژەرە ئەمریکاییەکانە. ئەوانەی تەماشای دیمەنە نائەخلاقییەکان دەکەن بۆ ماوەیەکی کەم بەهۆی پەرتەوازەیی تەرکیزیانەوە ناتوانن کاردانەوە و ئاگادارکردنەوەکانی چواردەور وەربگرن.

هەستاون بە نیشاندانی سەدان وێنەی سروشت و باڵەخانە بەو کەسانەی تاقیکردنەوەکەیان لەسەر ئەنجامداون. ئەرکی ئەو کەسانە ئەوە بووە لە وێنەکاندا تەماشای شتێکی دیاریکراو بکەن، زاناکان لەپێش ئەم وێنانەدا دوو تا هەشت وێنەی نەشیاویان دادەنا تا بزانن ئایا کاریگەریی لەسەر توانستی وەرگرتنیان دەبێت یان نا. بەپێی ئەمە هەتا دیمەنە نەشیاوەکانی نێوان وێنە ئاساییەکان زیادی کردبا، ئەو کەسانە لە دۆزینەوەی شتە دیاریکراوەکەی نێو وێنە ئاساییەکاندا سەختییان دەچەشت. بە ڕای زاناکان ئەو پاڵنەرانەی هەستەکان دەبزوێنن، چ بە لایەنی ئەرێنی بێت یان بە لایەنی نەرێنی، بە هەمان شێوە کار لە سەرنجی مرۆڤ دەکەن.

وابەستەیی دیمەنە نائەخلاقییەکان دەبێتە هۆکاری ئەوەی کەسەکە لە شەهوەت و پەیوەندیی زایەندی زیاتر بیر لە شتی تر نەکاتەوە و ئیدی کەموکورتی ڕوو لە کارەکانی بکات و پەیوەندییە هاوڕێیەتییەکانی زیانیان پێ بگات و هەستی تاوانباری دای بگرێت. وەك چۆن مرۆڤەکانی ئالودەی مەیخواردنەوە ناتوانن ببنە خاوەنی زیهنێکی تەندروست، ئەو مرۆڤانەش کە

لە ئاستی ئالودەییدا گیرۆدەی دیمەنە حەرامەکان بوون، ئەستەمە خاوەنی عەقڵێکی هاوسەنگ بن. وەك چۆن دەرگای گەدە دەمە، دەرگای مێشکیش چاوە، لەبەر ئەمە بەدڵنیاییەوە بۆ سەلامەتی و تەندروستیی دونیا زۆر پێویستە چاوەکان لە بەرامبەر حەرامدا پارێزگارییان لێ بکرێت. هەروەك تەندروستیی مێشك، لە ڕوانگەی تەندروستیی جەستەییشەوە دوورکەوتنەوە لە ڕوانینی حەرام وەك پێویستییەك تەماشادەکرێت.

سەرەڕای نەخۆشییە زیهنی و دەروونییەکان، لە ئەنجامی زینادا کە بە تەماشاکردنی حەرام دەستپێدەکات و دواجار لە ئەنجامدانی حەرامدا خۆی دەبینێتەوە، چەندین نەخۆشیی جەستەیی هەن کە چاوەڕوانی ئەنجامدەرانی ئەو کارە دەکەن. ناودارترینی ئەمانە ئایدزە کە وەك لای هەمووان ئاشکرایە نەخۆشییەکی کوشندەیە و لە ڕێگەی بەدڕەوشتییەوە دەگوازرێتەوە. دەبێت گەنجان لە کوشندەیی و زیانەکانی ئەم نەخۆشییە ئاگادار بکرێنەوە و باشترین ڕێگاش بۆ ئەوەی نەکەونە ناو ئەم بیرە تاریکەوە، پیاسەنەکردنە لە چواردەوری بیرەکەدا.

## شیفای ڕاستەقینە، نەخۆشنەکەوتنە.

لە زانستی تەندروستی ئەمڕۆماندا، پاراستنی تەندروستی ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی پێ دەدرێت. چەمکێکی تریش کە بە هەمان شێوە لە بەرەوپێشچووندایە بریتییە لە دەستنیشانکردنی دروست و زووی نەخۆشییەکان. لە چارەسەری نەخۆشییە دەروونی و مەعنەوییەکانیشدا ئەم دوو چەمکە ڕۆژ بە ڕۆژ گرنگی زیاتر پەیدا دەکەن.

دایك و باوکان چۆن لە بەکارهێنانی مادده ئالودەکەرەکانی وەك ماددەی هۆشبەردا هەستیاری دەنوێنن و نالێن "با تاقی بکاتەوە، کە خراپییەکەیی بینی خۆی وازی لێ دەهێنێت!"، مەرجێکی سەرەکییە لە بەرامبەر دیمەنە نائەخلاقییەکانیشدا کە ژیانی مەعنەوی منداڵەکانیان دەڕوخێنێت هەستیاری و تێگەیشتنێکی پارێزکارانە لەنێو خێزانەکاندا دابنێن. لە هەمان کاتدا چاودێریکردنی بەردەوامی منداڵەکانیان بەبێ هەستپێکردنی خۆیان و دوور لە بێزارکردن سەلامەتترین ڕێگا دەبێت بۆ دەستنیشانکردنی پێشوەخت و دروستی ئەو نەخۆشییەی بەردەوام ئەگەری تووشبوونی لە ئارادایە.

بێگومان هەوڵدان بۆ خۆپاراستن سەرەکیترین کارە بۆ ڕێگرتن لە تووشبوون. بۆ ئەمەش پێویستە ئەو کەسە زیانەکانی نەخۆشییەکە بزانێت. لەم حاڵەشدا پێویستە چەندە بە ڕووی بەدڕەوشتیدا داخراوە، هێندەش بە ڕووی وەرگرتنی زانیاریدا کراوە بێت. بەڵام هۆشداریدانیش بەتەنها بەس نییە، چونکە ڕەنگە گەنج لەو حاڵەدا کە هەستەکان لەگەڵ پاڵنەرە جەستەییەکاندا بەیەك دەگەن هەموو کات ڕێگای عەقڵ نەگرێتە بەر.

لەبەر ئەمە پێویستە ژینگەیەکی پارێزکار لەنێو خێزاندا بەرجەستە بکرێت. ئەم ژینگەیە لە هەمان کاتدا دەرفەتی ئەوە دەڕەخسێنێت کە گەنج بەراورد لەنێوان ژینگە زیانبەخشەکانی دەرەوە و ژینگە تەندروستەکەدا بکات. بە پێچەوانەوە گەر لە بەکارهێنانی هۆکارەکانی وەك تەلەفزیۆن و گۆڤار و ئینتەرنێتدا جیاوازیی نێوان زیانبەخش و بێزیان بزر ببێت، بە مانای ئەوەی دیمەنە زیانبەخشە بەدڕەوشتییەکان بەبێ هیچ سانسۆرێك بێتە نێو ماڵەکانەوە، لە هەمووی خراپتر گەر دایك و باوکانیش بەرامبەر بەم جۆرە ڕاگەیاندنانە

هەستیاری نەنوێنن، ئەو کات گەنجان توانای ئەوە لەدەست دەدەن زیانبەخش و بێزیان لە یەکدی جیا بکەنەوە.

یەکێك لەو دەربڕینانەی خێزان لە بەرامبەر ڕێنوێنیی پارێزگاریی گەنجاندا بە زۆری دەیخاتە ڕوو، ئەو ڕاستییەیە کە منداڵان و گەنجان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا هەر چۆنێك بێت ڕووبەڕووی هاوشێوەی ئەم شتانە دەبنەوە. لە تەندروستیی جەستەشدا بەدەستهێنانی خاوێنی ڕەها کارێکی سەختە و ڕەنگە ببێتە مایەی زیانیش. بەڵام پەنابردن بۆ زبڵدان یان هێنانەژوورەوەی زبڵی کۆڵان بۆ بەدەستهێنانی بەرگریی جەستە یان بە بیانوی ئەوەی خۆپاراستنی ڕاستەقینە لە میکرۆب بەدەست نایەت، کارێکی عاقڵانە نابێت.

## جەوهەری ئایین

ڕۆژێکیان لە حەزرەتی حەسەنی بەسرییان (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) پرسی "خاوێنیی ئایین چییە؟ جەوهەری ئایین گوزارشت لە چی دەکات؟ خەزێنەی ئایین چییە؟" ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی:

"خاوێنی ئایین دەستنوێژگرتنە. جەوهەری ئایین، بریتییە لە ترسان لە خوای پەروەردگار و حەیاکردن. هێزی ئایینیش، نوێژە. چونکە خوای پەروەردگار، پەسنی ئەو بەندەیەی کردووە کە بەحەیایە. خەزێنەی ئایین زانستە. چونکە هەرکەسێك دەستنوێژی نەبێت، ئایینی خاوێن نابێت. هەرکەسێك حەیای نەبێت، جەوهەری ئایینیش لەو کەسەدا بوونی نابێت. ئەوەی ترسی خوای پەروەردگاری لە دڵدا نەبێت، جەوهەری ئایینیشی تێدا نابێت. ئەوەی زانستی نەبێت، نابێتە خەزێنەی ئایین."

## ٣. چاوت بپارێزە، با ڕەوشتت پارێزراو بێت

ئەو چاوانەی لە حەرام ناڕوانن،
ئاگری دۆزەخ نابینن.
(ئەصفەهانی)

### خۆت بناسە

دەستورێك هەیە دەڵێت "گەر بەخشینی نەویستایە، ویستنی پێ نەدەبەخشی" هەر وەك ئەو دەستورەی کە دەڵێت "جوانی و کەماڵ خۆش دەویسترێن". بەڵێ، مرۆڤ هەر لە فیترەتدا جوانیی خۆش دەوێت. بەتایبەتیش گەر ئەو جوانییە لە ڕەگەزی بەرامبەرەوە سەرچاوەی گرتبێت، ئەم وابەستەییە وەك موگناتیسێك بەسەر سروشتی مرۆڤدا زاڵ دەبێت. گەر نەشبێتە وابەستەییەکی زیانبەخش، پێویستە لەپێناو دروستیی دامەزراوەی خێزان کە سەرچاوەی بەردەوامی نەوەکان و خۆشگوزەرانیی کۆمەڵگایە، وەك پێویستییەك لێی بڕوانرێت.

بەدڵنیاییەوە، ئەو هەستی ویستنەی کە مرۆڤ بۆ ڕەگەزی بەرامبەر هەیەتی، ئەنجامی پڕۆگرامکردنێکی ئیلاهییە و ناکرێت بە خراپ تەماشا بکرێت. کە دەبینین نەخۆش سەرەڕای پێداگری و ئاگادارکردنەوەی پزیشکەکەی، کەمتەرخەمی لە بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەدا دەکات کە چێژ لە قوتدانیان نابینێت، کەچی خواردنی ئەو خواردنە بەتامانە لەیاد ناکات کە چێژیان لێ وەردەگرێت و هەست بە پێویستییان دەکات. ئەمە بۆمان دەردەخات کە چێژوەرگرتن و هەستکردن بە پێویستی لە بابەتە گرنگەکانی ژیانیشدا

ناچارییە. بەم مانایە ویست و چێژ لەمەڕ پەیوەندیی ڕەگەزی بەرامبەردا بۆ بەردەوامبوونی نەوەکان گرنگییەکی زۆری هەیە. بۆ ئەوەی بابەتەکە لە زەمینەیەکی ڕاست و دروستدا دابنێین، دەبێت بزانین کە ئەمە شتێکی فیترییە و فیترەتیش یاسایەکی خوای گەورەیە. ئەو کەسەی لە خواردندا سەرەڕای چێژبەخشییان خۆی لە خۆراکە زیانبەخشەکان بەدوور دەگرێت، پێویستە خۆیشی بەدوور بگرێت لە پەیوەندیی زیانبەخشی ڕەگەزی بەرامبەر یاخود ئەو پەیوەندییەی کە دەکرێت زیانی پێ بگەیەنێت.

## ڕوانین، قەدەغەکراو دەکاتە شتێکی ئاسایی

زۆر گوناه هەن کە بە تەماشاکردن دەست پێ دەکەن. دەستلێدان، پێکەوە مانەوە، ماچکردن و زیناکردن. مرۆڤ دەیان نمونەی ئەم کردەوانە لە میدیای بینراو و نووسراودا دەبینێت و وەك شتانی ئاسایی لێیان دەڕوانێت، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە بەردەوام بەرچاوی دەکەون.

بە جۆرێك، دیمەنی نابەجێی نێو میدیای بینراو و بیستراو سەرەتا لەنێو کۆمەڵێکی بچوکدا نیشاندراوە و، دواتر مرۆڤەکان بەردەوام ئەمانەیان بینیوە پاشانیش ئەم پەڕگرییە بۆ هەندێك بووەتە شێوازێکی ژیان. ئەو کەسانەش کە ڕۆژانە لە ئۆرگانەکانی میدیادا بینەری ئەم دیمەنانە بوون، لەبەر ئەوەی لێواری تەماشاکردنیان بەزاندووە، بە شێوەی "خۆ ئەمە چی تێدایە!" بیر دەکەنەوە و هەر لەو خولگەیەشدا ڕەفتار دەکەن. ئەو کەسەی لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا شێوازێکی ژیانی لە لا ئاسایی دەبێتەوە کە نامۆیە بە نەریت و کەلتوری خۆی، ئیدی دەست دەکات بە پەیڕەوکردنی ئەو شێوازی ژیانە، پاشان وردە وردە

بەو ڕەفتارانە ئاشنا دەبێت كە بۆ ئەو ئاسایی نین و دواجاریش دەست دەكات بە بەرجەستەكردنیان لە ژیانیدا. تەنانەت وای لێدێت ئەوانەی بەو شێوەیە ناكەن لە نێو چینی ئەو جۆرەی كۆمەڵگادا وەك كەسانی نامۆ تەماشا بكرێن.

بەڵێ، مرۆڤ لەگەڵ تەماشاكردن و بینینی بەردەوامیاندا وای لێ دێت وەك شتانی ئاسایی تەماشای نائاساییەكان بكات. گرنگترین هۆكاری ئەمەش بریتییە لە كارێكی ئاسان كە ئەویش "تەماشاكردنە".

دەمانەوێت لەم بابەتەدا ئەم ڕاستییە بخەینە ڕوو "سەد ساڵ لەمەوبەر و كاتێك شانۆ هاتە نێو خاكی موسڵمانانەوە، هونەرمەندەكان بە سەرپێچێكەوە دەهاتنە سەر شانۆ كە تەنها ملیان ڕووت دەبوو. لەگەڵ بینینیدا خەڵكی بەم شێوازە ڕاهاتن، لەكاتێكدا ڕووتیی مل پێچەوانەی یاسای داپۆشراوی بوو، لەبەر ئەوەی فەرمانی "پاراستنی چاو بەرامبەر حەرام" پێشێلكرابوو، هەستیاریی ئەم خاڵە بەزێنرا. لەپاش ئەمەدا بە لابردنی سەرپێچەكە قژەكان بەتەواوی بەردرانەوە. بە هەمان شێوە، بەرگی نیوقۆڵ شوێنی بەرگە قۆڵدرێژەكانی گرتەوە، لە هەنگاوێكی پاشتردا بەرگە بێقۆڵەكان هاتن. لە سەرەتای ئەو ڕێیەشدا كە بەرەو تەنورەی كورت ڕۆیشت، ئەو مۆدێلانە هەن كە كەمێك لە پاژنە بەرەو ژوورن. دواتر مۆدێلەكانی سەر ئەژنۆ و دواتریش مۆدێلەكانی پێنج پەنجە سەروو ئەژنۆ بەدیاركەوتن. كورتبوونەوەكەش هەنگاو بە هەنگاو لە بەردەوامیدایە.

بەكورتی، گشتگیربوونی بێحەیاییەكی تایبەت بە ڕێگای بینین بەرجەستە دەبێت. بە بینینی چاوەكان ئەوەی لە "دەرەوەی یاسا"یە، دەبێتە "یاسا"، نائاسایی "ئاسایی" دەبێتەوە. فەرمانی "پاراستنی چاوەكان لە حەرام"

کە ڕووی لە پیاوان و خانمانی ئیماندارە، ئەم نزمبوونەوە گشتگیرە هەر لە سەرەتاوە دەوەستێنێت.

## بۆ ئەوەی ببینە یەکێک لە قارمانانی پاکیزەیی

کاتێك لە مامۆستا "فەتحوڵڵا گولەن"یان پرسی "پاکیزەیی مانای چییە، ئەو تایبەتمەندییانە چین کە چوارچێوەی پاکیزەیی دیاری دەکەن؟"، بەم ڕستانەی خوارەوە وەڵامی دایەوە:

"عیففەت، واتە دووربوون لە گوفتار و ڕەفتارە ناشرینەکان و، مانەوە لە بازنەی ئەدەبدا و، ژیانی وابەستەی ڕاستی و دروستی و بەها ئەخلاقییەکان. ئەم وشەیە کە لە بنەڕەتدا عەرەبییە، وەك گوزارشت لە دۆخی دارایی نامووس و شەرەف و ڕەوشت هاتووەتە نێو زمانەکەمانەوە."

بەتایبەتی لە وتە و پەخشانە دێرینەکاندا وشەی "عەفیف" بۆ ئەو کەسانە بەکارهاتووە کە بە عیززەت و شکۆوە دەژین و، دەست بۆ ماڵی کەس نابەن و، خۆیان لە حەرامەکان بەدوور دەگرن و، لە بابەتی پاراستنی نامووسدا هەستیارییەکی بێوێنەیان هەیە.

شارەزایانی ڕەوشتی ئیسلام ئاماژەیان بەوە داوە کە سێ هەستی ئەساسی لە مرۆڤدا بوونیان هەیە، ئەو لایەنەی لە ئاستێکی دیاریکراویشدا بێت ڕاستییەکان دەبینێت و، شتە زیانبەخش و سوودبەخشەکان لێك جودا دەکاتەوە پێی دەوترێت "هێزی عەقڵی"، "هێزی تووڕەیی" کە بە سەرچاوەی هەستەکانی وەك کین و، ڕق و، تووڕەیی هەژمار دەکرێت، ئەو هەستەش کە سەرچاوەی حەز و ئارەزوو و حەزە جەستەییەکانە پێیان وتووە "هێزی شەهەوی". دۆخی

زیادەڕەوی هێزی شەهەوی دابڕانە لە بەهای ڕەوشت لە ڕادەیەکدا کە هەموو تاوانێك ئەنجام بدرێت، ئەمەش بە "فسق و فجور" ناوبراوە. دۆخی بێهەستی و بێجوڵەییش لە بەرامبەر نیعمەت و لەزەتە حەڵاڵەکاندا بە ساردیی ناوبراوە. کاتێك مرۆڤ لە ڕووی هێزی شەهوەتەوە لە ڕاستەڕێ و هاوسەنگیدا ماوەتەوە و، لەگەڵ ویستنی چێژ و لەزەتەکانی نێو بازنەی حەڵاڵدا بە ئیرادەیەکی پتەوەوە بەرامبەر حەز و ئارەزووە قەدەغەکان داخراوبووە، زانایان ئەم دۆخەیان بە "عیففەت" ناوبردووە. عیففەت (پاکیزەیی) لەم گۆشەیەوە بە واتا گشتییەکەی بریتییە لە بەکارهێنانی هێزی ئیرادە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئارەزووە جەستەییەکان و، دوورکەوتنەوە لە لادان و زینا.

قورئانی پیرۆز، ئەوەی خستووەتە بەرچاو کە ئیمانداران مرۆڤانی بەعیففەت و بەحەیان و شوێنی ئەدەبیان دەپارێزن.[1]

هەروەها مژدەی ئەوەمان پێدەدات کە خوای گەورە لە بەرامبەر ئەو پارێزگارییەماندا بە پاداشتی نەبڕاوەی دوارۆژ شەرەفمەندمان دەکات.

﴿ وَٱلْحَـٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَـٰفِظَـٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾

(الاحزاب: ٣٥)

"پیاوان و ئافرەتانی داوێنپاك و ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێبوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێسنووریان لە لایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە (هەر کە دونیایان بەجێهێشت پێی شاد دەبن)".

---

١. المؤمنون: ٥-٧.

لەبەر ڕۆشنایی گرنگی بابەتەکەدا فەرمان بە سەرجەم پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار دەکات بەعیففەت بن و لە دەرگای بێعیففەتی نەدەن کە نەزەری حەرامە:

﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾(النور: ٣٠-٣١)

"(ئەی پێغەمبەر) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکتر و پوختترە بۆیان (بۆ دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ڕۆح و لاشەیان) بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن. بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و جوانیی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە (وەك دەم و چاوو دەست)"

لە هەمان کاتدا بە نیشاندانی حەزرەتی یوسف و حەزرەتی مەریەم وەك نمونەی پاڵەوانانی عیففەت، ئاسۆی حەیا و چاکەکاریی بۆ ئیمانداران خستووەتە ڕوو.

بەڵێ، حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَام) لە بەرامبەر بانگهێشتێکی خێزانی وەزیردا بۆ ئەنجامدانی گوناهـ فەرمووی "پەروەردگارا! زیندانم پێ باشترە لەو کارەی ئەم ئافرەتانە منی بۆ بانگهێشت دەکەن."

﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾(یوسف: ٣٣)

"یوسف کە ئەمەی بیست وتی: پەروەردگارم من زیندانم لە لا

خۆشەویستترە لەوەی کە ئەوان بانگم دەکەن بۆی، خۆ ئەگەر لە فێڵ و تەڵەکەی ئەوانە ڕزگارم نەکەیت و لە پیلان و نەخشەکانیان دەربازم نەکەیت و لام نەدەیت،لەوانەیە منیش مەیلم بۆ دروست ببێت و ئارەزوویان بکەم پاشان بچمە ڕیزی نەفام و گوناهبارانەوە.“

دەبینین ئەم پێغەمبەرە ئازیزە ئامادەبووە چەندین ساڵ لە زینداندا بمێنێتەوە لەپێناو ئەوەی گەردێك لەسەر عیففەتی نەنیشێت، بەم جۆرە وەك تیمسالێکی حەیا و پاکیزەیی بووە سەرمەشق بۆ هەموو ئەو ئەهلی ئیمانەی تا قیامەت دێت. جەنابی حەق دەفەرمووێت:

﴿ وَٱلَّتِىٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (الانبياء: ٩١)

”یادی (مەریەم) یش بکەرەوە، ئەو ئافرەتەی داوێنی خۆی بە خاوێنی ڕاگرت، ئێمەش لەو ڕۆحەی خاوەنی بووین پێمان بەخشی و خۆی و کوڕەکەیمان کرد بە (موعجیزە) و بەڵگە بۆ هەموو خەڵکی.“

بەم جۆرە حەزرەتی مەریەمیش نمونەیەکی باڵای پاکیزەییە بۆ سەرجەمی مرۆڤایەتی. مەریەمی دایکمان کە لە نەزایەکی پاك و پاراودا بە پاکیزەیی و شەرەفەوە پەروەردەبووبوو، بەو چییەتییە بێئەندازە خاوێنەیەوە بووبووە پارچەیەك لە پاکیزەیی. هەر لەبەر ئەمە لە بەرامبەر وتەی نابەجێی ئەو کەسانەدا کە لەدایکبوونی حەزرەتی عیسایان لەسەر زاران دەهێنا و دەبرد، فەرمووی ”خۆزگە پێش ئەوەی ئەمەم بەسەر بێت بمردمایە و بووبوومایە بە کەسێکی لەیادکراو!“

﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِى مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيًا مَّنسِيًّا ﴾ (مریم: ٢٣)

"ئنجا ژانی منداڵبوون گرتی و بردی بۆ لای قەدی دارخورمایەك (بەدەم ئاهوناڵەوە) دەیوت: پێش ئەوەی ئەمەم بەسەر بێت بمردمایە و بووبوومایە بە کەسێکی لەیادکراو!"

لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەم واتا گشتگیرەی پاکیزەییدا، دەکرێت بە شێوازێکی فراوانتریش باسی لێوە بکەین. بەو پێیەی کە بەدیعوززەمان دەڵێت "بازنەی حەڵاڵ فراوانە، بۆ کەیفمان کافییە. هیچ پێویستی بە چوونە نێو حەرام ناکات"، پاکیزەیی واتە ژیان لە نێو بازنەی ڕێپێدراودا بە جۆرێك چاو نەبڕرێتە مەیدانی ڕێپێنەدراو و، دەستی بۆ درێژ نەکرێت و، هەنگاویشی بۆ نەنرێت. بەم شێوەیە دەبێت مرۆڤی خاوەن پاکیزەیی بە چێژەکانی نێو بازنەی حەڵاڵ بۆ سەرجەم ئەندامانی جەستەی وەك چاو و گوێ و دەست و قاچ ڕازی بێت و، بە هیچ شێوەیەك و بە هیچ ڕێگایەك پەنا بۆ حەرام نەبات و، لەو دۆخانەش بەدوور بێت کە شکۆی لەکەدار دەکەن.[1]

## سێ پاڵەوانی پاکیزەیی

پاڵەوانانێك هەن لە ڕۆخی گوناهـ و کەناری کەندەڵان دەگەڕێنەوە و لە فەلاکەتێکی گەورە ڕزگاریان دەبێت:

١. کاتێك باس لەوە دەکرێت کە حەوت گروپ لە مرۆڤەکان لە ڕۆژی مەحشەردا لەژێر "سێبەری خوا"دا داڵدە دەدرێن و دەپارێزرێن، ئاماژە بۆ قارەمانێکی پاکیزەیی لەم جۆرە دەکرێت.

ئەو پیاوە جوامێرەی لە پارێزگاریکردنی ناموس و شکۆی خۆیدا خاوەن هەستیارییەکی لە ڕادەبەدەرە و، بەرامبەر هەستە شەهوانییەکانی

١. م. فەتحوڵلا گولەن، بارانەکانی پاشنیوەڕۆ، ل.٣٧٩-٣٨١.

خاوەنبڕیارە و، بە نرکەی "من لە خوا دەترسم!" وەڵامی ئەو ئافرەتە خاوەن جوانی و سەروەتەی داوەتەوە کە بانگهێشتی گوناهی کردووە، توانیویەتی بە ئیرادەی عەقەبەیەکی وەها ببڕێت کە بڕینی وەك مەحاڵ دێتە پێش چاو.

٢. ئەو گەنجەش کە نووری چاوی حەزرەتی عومەرە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، یەکێکە لە نوێنەرانی ئەو ئاسۆی پاکییە. ئەویش کاتێك خەریك بوو بکەوێتە داوێکەوە و کەمێك مەیل بە لای گوناهدا بکات، ئەم ئایەتە پیرۆزەی یادهاتەوە:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴾ (الأعراف: ٢٠١) .

"بەڕاستی ئەوانەی کە پارێزکار و تەقوادار بوون، کاتێك خەتەرەو خەیاڵێك لە لایەن شەیتانەوە تووشیان بێت، ئەوە خێرا بێدار دەبنەوە و خوای خۆیان بیر دەکەوێتەوە و هۆشیار دەبنەوە، ئیتر دەستبەجێ بینا دەبن و بەرچاویان ڕوون دەبێت."

بۆیە شەرمی پەروەردگاری مەزن دایگرت و، لە ڕۆخەکانی گوناه گەڕایەوە. گەڕایەوە بەڵام ویژدانی مەیلێکی کەمی وەهاشی قەبووڵ نەبوو، دڵی بەرگەی ئەو جۆشەی نەگرت کە لە ترسی خوای گەورەوە پەیدابووبوو، بۆیە هەر لەوێدا کەوت و گیانی سپارد. ئەگەرچی جەستەی لەوێشدا کەوتبێت، ئەو "شەهیدی عیففەت" یان "شەهیدی پاکیزەیی" بوو و، بەسەرهاتەکەی وەك یادێکی جوان و قەشەنگ گەیشتووە بەمڕۆمان.

٣. لە فەرموودەیەکی پیرۆزیشدا کە بە "فەرموودەی ئەشکەوتەکە" ناسراوە، باس لە قارەمانێکی تری پاکیزەیی دەکرێت. سێ کەس بۆ بەسەربردنی شەو پەنا دەبەنە بەر ئەشکەوتێك، تاشەبەردێکی گەورە لە

چیاکەوە بەردەبێتەوە و دەرچەی ئەشکەوتەکە دەگرێت، ئیدی ناتوانن لەوێ دەربچن. لەسەر ئەمە هەریەکەیان کردەوەیەکی خۆی کە پێی وایە لە لای خوا قەبووڵ بووە، دەکاتە هۆکار و داوا لە خوای گەورە دەکەن تاشەبەردەکە خل ببێتەوە و دەرچەکەیان بۆ چۆڵ بکات. بە دوعای هەریەکەیان بەردەکە کەمێك دەجوڵێت و دواجار ئەو سێ هاوڕێیە ڕزگاریان دەبێت. یەکەمیان، ڕەفتاری چاکی خۆی بەرامبەر دایك و باوکی دەکاتە هۆکار، سێهەم کەسیان ئەوە دەخاتە ڕوو کە جارێکیان نەیتوانیوە کرێی کرێکارەکەی بدات بەڵام دواتر کاری بە پارەکەوە کردووە و بە زیادکراوی و بەبێ کەموکوڕی پێی داوە، لەبەر تیشکی ڕێزی ئەو کردەوەیەدا داوای یارمەتی لە ڕەحمەتی پەروەردگاری دەکات. دووەم کەسیش دەڵێت "خوایە گیان، کچێکی مامم هەبوو.

ئەوم لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەویست. پێم وت بەڵام هیچ ڕووی نەدامێ. لە ساڵێکی گرانیدا کەوتە بەردەستم. لەبەرامبەر ئەوەی خۆی تەسلیمی من بکات، سەد و بیست دینارم پێدا، لەناچاریدا ئەمەی قەبووڵ کرد. لەو کاتەدا کە دەگەیشتم بە ویستەکەم، پێی وتم "لە خوا بترسە و دەست لە عیففەتم مەدە!" منیش لەسەر ئەو قسەیە، سەرەڕای ئەو هەموو هەست و ئارەزووەم بۆی، وازم لێی هێنا، ئەو پارەیەشم لێ وەرنەگرتەوە کە پێم دابوو. خوایەگیان گەر من ئەمەم بۆ ڕەزامەندیی تۆ کردبێت، لەم ناڕەحەتییە ڕزگارمان بکە!" بەم جۆرە پاراستنی پاکیزەیی خۆی وەك کردەوەیەکی چاك و وەرگیراو دەخاتە بەردەم پەروەردگار.

بەڵێ، هاوتای ئەو قارەمانێتییانەی پیاوانی خاوەن پاکیزەیی نێو ئەم سێ نموونەیە بەرجەستەیان کردووە زۆر دەگمەنە. ئەمانە چەند سەرکەوتنێکی

زۆر جیاوازی ئیرادەی مرۆڤن. نەكەوتن لەو جۆرە دۆخانەدا سەركەوتنێك نییە هەموو مرۆڤێك بتوانێت پێی بگات. زۆر كەس لەسەر ئەو زەمینە خلیسكانە ناتوانن خۆیان بە پێوە ڕابگرن و دەكەون.

## ٤. چاوت بپارێزە، تا دڵت پارێزراوبێت.

### نەگێڕانەوەی چاوەکان لە حەرام پێچەوانەی فیترەتە

کاتێك مرۆڤ چاوەکان لە حەرام ناپارێزێت، بەم کارەی پێچەوانەی فیترەت مامەڵە دەکات. چونکە ئەم ڕوانینانە، ڕێگە لە گەشەکردنی زۆرێك لەو هەستانە دەگرێت کە بە مرۆڤ بەخشراون. مرۆڤێکی وەها، سەرجەم وزە و ئیرادەی دەکاتە فەرمانداری هەستە شەهوانییەکانی و، بەم جۆرەش بەبێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات، دەبێتە ڕێگرێك لەبەردەم گەشەکردن و دەرکەوتنی ئەو لایەنە مرۆیی و مەعنەوییانەی تری کە بە ماتی لە نێو ڕۆحیدا بوونیان هەیە. نمونەی هەرە بەرچاوی ئەمە لە ژیانی ئەو کەسانەدا دەبینین کە هەموو تەمەنیان لە ژێر فەرمانی ئەم هەستانەیاندا بەسەر دەبەن و ئەمەشیان کردووەتە پیشە.

بەڵێ، چەندین خاوەنچاو هەن بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، نەك تەنها چاویان بەڵکو لایەنە ئیرادی و ڕۆحی و مەعنەوییەکانیشیان لە شوێنی خۆیدا بەکار ناهێنن و، دەرکیان بەوە نەکردووە کە ئەندامەکانی تریشیان خزمەت بەو دەکەن. چەندین مرۆڤ هەن کە هەموو کاتەکانیان بەوەوە بەسەر دەبەن باسی ئەنجامی ڕوانینە حەرامەکانیان بۆ یەکدی بکەن، کاتێکیش بەتەنها دەمێننەوە کاتیان بە خەیاڵی ئەوەوە بە فیڕۆ دەدەن کە بینیویانە. لەم ڕێیەدا چەندین تەمەن بەهەدەر دەچێت. هۆکاری هەموو ئەمەش تەنها ڕوانینێکە. ئەم کەسانە لە ڕوانینێکدا، یاخود لە ماچێکدا ژیانی خۆیان ڕەش دەکەن. لەکاتێکدا مرۆڤ خۆی بۆ ئەوە بەدیهێنراوە ببێتە بەندەی خوا، لەبەرامبەر ئەم دیمەنانەدا کە دەیخەنە نێو دۆخێکی ڕۆحیی ناساغەوە، زۆر کەس بەرامبەرەکەی وەك شتێك

دەبینێت كە بەتەنها لە ماددە پێكهێنراوە و هەست و لایەنە ناسكەكانی بە هیچ هەژمار دەكات. كاتێك ئەم جۆرە مرۆڤانە لەنێوان خۆیاندا قسە دەكەن، زۆر شت ئەگەرچی پەیوەندیی بە بەدڕەوشتیشەوە نەبێت بەڵام بە واتا نەشیاوەكان بۆ یەكتری باس دەكەن و بەمەش ئیسرافی كاتەكەیان دەكەن. هەموو ئەمانە ئەگەر تێكچوون و بۆگەنكردنی فیترەت نەبێت دەبێت چی بێت؟

## حەرام و تێكچوونی مرۆڤ

ئەمڕۆ گرنگینەدان بە ڕوانینی حەرام و، لە ئەنجامی ئەمەشدا پەروەردەبوونی كەسانی نەخۆش و كراوەبوونیان بە ڕووی زینا و هەموو جۆرە پەیوەندییەكدا بابەتەكانی لەوە دەركردووە كە بەتەنها كێشەی گەنجان بن. دەبێت بە چ شێوازێك ئەم بابەتە لەمڕۆدا بۆ كەسانی پێگەیشتوو و، ئەو كەسانە باس بكرێت كە تەمەنیان گەورەیە بەڵام هەستیاریی ئەم بابەتانەیان بەتەواوەتی بزركردووە؟

"گوێ و چاو و دڵ، هەموو ئەمانە لەو بەرپرسیارن."

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ (الإسراء: ٣٦)

"(ئەی مرۆڤ) لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەكەوە كە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونكە بەڕاستی دەزگاكانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەرهەمووی، بەرپرسیارە لەبەرامبەریەوە."

لەم ئایەتە پیرۆزەوە بۆمان دەردەكەوێت سەرەتا پێویستە باس لەوە بكرێت

کە مرۆڤ لێپرسینەوەی لەسەر هەموو کردەوەکانی لەگەڵدا دەکرێت و لە بەکارهێنانی ئەندامانی جەستەیدا خاوەنی ئازادیی ڕەها نییە. جەنابی کەریم بۆ بیستنمان قوێیکەکانی پێبەخشیوین، بەڵام قەدەغەی کردووە بەو گوێیانە گوێبیستی گوفتار و نەغمە حەرامەکان ببین. گەدەی پێداوین بەڵام قەدەغەی کردووە پارووی حەرامی تێ بکەین.

چونکە گەر ئەو پاروەە حەرامە "زەمزەم"یش بێت، خورمای حیجازیش بێت پاش ئەوەی حەرام دەبێت، ڕێگەمان نادات بیخۆین. خوای پەروەردگار بە وێنەی گەدەمان، بەسەر چاویشماندا باڵادەستە. ئازادیشمان هەیە هەموو ئەندامەکانی جەستەمان لەنێو بازنەی حەڵاڵدا بەکار بهێنین. مافی مامەڵەکردن بە موڵکێکی دیاریکراوەوە، تەنها بۆ خاوەنی موڵکەکەیە. تەماشاکردنی شتێك کە تەماشاکردنی حەرام بێت و لەگەڵیشیدا بوترێت "خۆ زیانی بۆ کەس نییە!" ، دەبێتە ڕازینەبوون بە فەرمانی پەروەردگار (جَلَّ جَلَالُهُ) و تاوانبارکردنی بە سەپاندنی فەرمانێکی ناپێویست. حاشا! گەر جەنابی حەق (جَلَّ جَلَالُهُ) حوکمی حەرامبوونی شتێکی دابێت، موتاڵایەکی جیاوازی بابەتەکە دەبێتە بیرۆکەیەکی پێچەوانەی ئیمان. چونکە "کاتێك خوای پەروەردگار (جَلَّ جَلَالُهُ) و پێغەمبەرەکەی حوکمی شتێك دەردەکەن، ئیدی چ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار مافی هەڵبژاردەیەکی تریان نابێت لەمەڕ ئەو کارانەیاندا. هەرکەسێکیش لە خوا و پێغەمبەرەکەی یاخی ببێت، دەکەوێتە لادانێکی ڕوون و ئاشکراوە."

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴾

(الأحزاب: ٣٦)

"بۆ هیچ پیاوێكی ئیماندار یان ژنێكی ئیماندار، نییە كاتێك كە خواو پێغەمبەرەكەی بڕیاری شتێك بدەن ئەوان سەرپشك بن (لە ئەنجامدانی ئەو كارە، چونكە) ئەوەی سەرپێچی بكات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەكەی ئەوە ئیتر بەئاشكرا گومڕا و سەرلێشێواوە."

بەڵێ، گەر مرۆڤ وا بزانێت لەمانەدا ئازادیی ڕەهای هەیە، بە هەڵەدا چووە. چونكە لەو كاتەدا كە مرۆڤ لە بەهەشتی مەنزڵگای چێژە بێسنوورەكان بوو، نەخواردنی میوەیەك بووە مایەی هاتنەدەرەوەی. لە دونیای بووندا جوانیەكی ئەوتۆ بوونی هەیە كە هەرگیز مرۆڤ لە تەماشاكردنی تێر نابێت. چ لە خاڵی ناسینی پەروەردگاریدا بێت بە بینین، چ لە خاڵی تێركردنی پێویستیی هونەریدا بێت بە ئاسوودەكردنی چێژی جوانی، مرۆڤ دەتوانێت لە سنعەتی دروستكراوە بێسنوورەكانی پەروەردگاری بڕوانێت، تەنها لە ڕوانینی یەكێك لەمانەدا سنووردارکردنێكی دیاریكراو هەیە و لەپێناو تەندروستیی عەقڵی و جەستەیی خۆیدا لە دیمەنە شەهوەت ئامێزەكان بەدوور دەگیرێت.

## پێویستە چاوەكان بە شێوازێک بەكار بهێنین كە لەگەڵ ئامانجی دروستكردنیاندا یەكانگیر بێت

ئەو پەروەردگارەی فەرمانی بە پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار فەرمووە چاوانیان لە حەرام بپارێزن، خاوەنی موڵكی ڕەهایە. خاوەنی ڕاستەقینەی چاویشمان هەر ئەوە. خاوەنی موڵك، بەپێی ویستی خۆی مامەڵە بە موڵكەكەیەوە دەكات. جەنابی حەق داوای كردووە جوانییەكانی دروستكراوی دەستی خۆی ببینین و پێیان ئاشنا ببین. دەبێت ئەوەشمان لەیاد بێت كە هەریەك لە چاوانمان هۆكارێكی تاقیكردنەوەی دونیایە. لەم دونیای تاقیكردنەوەیەدا

خوای پەروەردگار سنوورێکی بۆ ئەو شتانە داناوە کە چاوانمان دەتوانێت بۆیان بڕوانێت و ئەو کەسانەشی ئاگادار کردووەتەوە کە ئەم سنوورە دەبەزێنن. ئەوە خوای گەورەیە کە ڕوانینی چاوانمانی بۆ شتانی حەرام قەدەغەکردووە. لەم بارەیەوە یەکەمین ئەرکی سەرشانی مرۆڤ بریتییە لە ڕەچاوکردنی ئامانجی بەخشینی چاو لە لایەن خواوە. وەك پێویستە هەموو نیعمەتێك لە شوێنی خۆیدا بەکار بهێنرێت، چاویش وەك نیعمەتەکانی تر دەبێت بەڕێکوپێکی و لە شوێنی خۆیدا بەکار بهێنرێت.

بەگوێرەی ئەوەی کە خوای گەورە نیعمەتەکەی بەخشیوە، پێویستە هەر خۆشی دانەری یاساکەی بێت. یاساکەش ڕوونە. بۆیە ئەوەی دەمێنێتەوە، پەیڕەوکردنی یاساکەیە لە لایەن مرۆڤەوە. ئەو مرۆڤەی هەست بەوە دەکات کە چاوەکانی وەك ئەمانەت پێبەخشراوە، دەبێت ویستی بەخشەری ئەم نیعمەتە بهێنێتە دی و تەماشای ئەو شتانە نەکات کە بەدیهێنەر تەماشاکردنیانی حەرامکردووە. واتە، موڵکەکە هی خوای گەورەیە و هەر خۆشی ئەو شتانەی بۆ دیاریکردووین کە نابێت لێیان بڕوانین.

## دڵی ڕەش و مۆرکراو

وەك دەزانین، هەموو گوناهێك لە دڵدا پەڵەیەکی ڕەش دادەنێت و گەر ئەو پەڵەیە دەستبەجێ بە تەوبە خاوێن نەکرێتەوە و لانەبرێت، دڵەکە ڕەش دەبێت و کە ئیمانیشی لێ دەرچوو ئیدی سەراپا دەبێتە پەراوێکی ڕەش. ئەم دڵە ڕەشە مۆر دەکرێ و مرۆڤەکەش لە ڕوانگەی ژیانی مەعنەوییەوە وەك بوونەوەرێکی بێهەست و نابینا و کەڕی لێدێت.

تا چەند باس لە سوودەكانى بابەتە ئايينييەكان بكرێت، دواجار گەر كەسێك هەستى بەندايەتى نەبێت ناتوانرێت بەتەواوى لە خووە خراپەكان بەدوور بگيرێت. هەرچەندە سوودى ئەو كارانە بدۆزرێتەوە كە خواى گەورە فەرمانى بە ئەنجامدانيان داوە و باس لە زيانى ئەو شتانە بكرێت كە خواى گەورە فەرمانى بە نەكردنيان فەرمووە، لەڕاستيدا ئەسڵى مەسەلەكە بريتييە لەوەى ئايا ئەوەى ئەنجام دەدرێت تەبايە لەگەڵ ڕەزامەنديى پەروەردگاردا ياخود نا.

مرۆڤ بەو ڕادەيەى بە هەستى بەندايەتى دەگات، بە شێوازێكى سروشتى هەوڵ دەدات بۆ ژيان بەو شێوازەى خواى گەورە پێى ڕازييە. ئەو مرۆڤەى بە مامەڵەكردن لەگەڵ سروشدا لەو بەهايە تێ دەگات كە لە لايەن جەنابى حەقەوە پێى دراوە، بێگومان بە شێوازێك مامەڵە دەكات كە لايەقى ئەوە بێت ببێتە جێنشين لەسەر زەوى. بەكارهێنانى ئەو ئامێرانەى بۆ ئەنجامدانى كارە هەستيارەكان دروستكراون، پێويستيى بە هەستيارى هەيە. گەر ئامێرێك لە شوێنى خۆيدا و بە ڕێكوپێكى بەكار نەهێنرێت، چاوەڕێى تێكچوونى لێ دەكرێت. لەبەر ئەوە مەرجە ڕێبەرى بەكارهێنەرى ئامێرەكە بەجوانى بخوێنرێتەوە.

بۆ نموونە ئەڵماس شوشەبڕێكى زۆر چاكە، بەڵام ژيرانە نييە هەستين كارێك بە ئەڵماس بكەين كە دەتوانرێت بە ئامێرێكى پێنج ديناريش بكرێت. چاوى مرۆڤيش لە بەنرخترين ئەڵماس بەنرخترە، گەر مرۆڤ بيخاتە دووى ئارەزووە ڕيسواكان، لە ئەنجامدا ئەوەى ئەم ئامێرە بەنرخەى بە مرۆڤ بەخشيوە، لێپرسينەوەى توندى لەسەر دەكات. چونكە مرۆڤ ئەم ئەڵماسەى لە ڕێگا نەدۆزيوەتەوە. چاو كە سنعەتێكى ناوازەى پەروەردگارە، گەر هاتوو

مرۆڤ بە شێوازێکی هەڵە و بە زیانی دڵ و ڕۆحی بەکاری هێنا، ئەو ئامێرە دەبێتە هۆکاری کوێربوونی مرۆڤ بەرامبەر دونیای مەعنەویات.

وەك چۆن خەڵوز بە بەراورد لەگەڵ ئەڵماس بەندێکی کاربۆنیی کەمە و بەم هۆیەوە ڕەش دادەگەڕێت و لەنێو گەرمکەرەوەکاندا دەسوتێت، بە هەمان شێوە ئەو دڵەش ڕەش دادەگەڕێت کە ئیمان کاری تێ نەکردووە. گەر چاوان بە نووری ئیمان ببینن و زیکری پەروەردگار بخەنە سەر زار، دەگونجێت ئەو دڵ و مێشکەی گوناھ و حەرامەکان ڕەشی کردوون لەو سایەیەدا ڕۆشن و پاراو ببنەوە.

## ٥. چاوت بپارێزە، تا ئایینت پارێزراو بێت

### تەقوا بە دوورکەوتنەوە لە حەرام دەست پێ دەکات

لە بابەتی تەقوادا، دوورکەوتنەوە لە حەرامەکان هەمیشە لەپێش ئەنجامدانی نافیلە و سوننەتەکانەوە بووە. لە سەردەمێکی وەهادا کە حەرامەکان چواردەوریان تەنیوە، دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لە هەموو جۆرە حەرامێك لە دۆخێکی زۆر لەپێشتردایە. چونکە وازهێنان لە حەرامێك، لە ئەنجامدانی سەدان سوننەت گرنگتر و پڕبایەختره.

لە کاروباری ڕۆژانەشدا بە هەمان شێوەیە. بۆ نمونە کاتێك ماڵێك خاوێن دەکرێتەوە، گەر لە لایەك لە پەنجەرەکەوە تۆز و خۆڵ بێتە ژوورەوە و، لە سەربانەوە ئاو بتکێتە خوارێ و، پیسییەکان بەردەوام لە دەرگاکەوە بێنە ژوورێ،

پێش هەموو شتێك پێویست دەبێت کون و کەلەبەرەکان بگیرێت و دەرگاکان دابخرێت. بە هەمان شێوە لە بەندایەتیشدا دوورکەوتنەوە لە گوناهەکان دەبێتە سەرەکیترین بنچینە. چونکە ئەو کەسەی خۆی لە حەرامەکان ناپارێزێت ئەو ئەنجامە بەدەست ناهێنێت کە لە ئەنجامدانی کردەوە ئەرێنییەکانیدا چاوەڕێی دەکات.

لەڕاستیدا مرۆڤ ئەو زاتەی خۆش دەوێت کە دروستی کردووە و بە میهرەبانییە دەراساکەی خۆی لە لای مرۆڤ خۆشەویستکردووە، هەوڵ دەدات بە ئەنجامدانی ئەو کارەی فەرمانی پێ دەکات و دوورەپەرێزیکردن لەو کارەش کە قەدەغەی کردووە، ئەمیش خۆی لە لای ئەو خۆشەویست بکات. دەبینین ئەو منداڵەی دایك و باوکی خۆش دەوێت، دەیەوێت بە قسەیان بکات و، خوازیارە بە گوێڕایەڵییان پاداشتیان بداتەوە. ڕەنگە خێزانەکەشی لەبەر ئەم هەڵسوکەوتە باشەی خەڵاتی بکەن، بەڵام لەڕاستیدا ئەو پاڵنەرەی وا دەکات منداڵەکە گوێڕایەڵیی دایك و باوکی بێت بریتییە لە هەوڵدانی بۆ شایەنبوون بە خۆشەویستیی بێبەرامبەری دایك و باوك کە سەرچاوەی چاکەی نەبڕاوەیانە لەگەڵ ئەمدا.

ئەو کەسەی ئیمان دەهێنێت، بە دوورکەوتنەوە لەو شتانەی خوای پەروەردگار قەدەغەی کردوون، هەوڵ دەدات خۆی بکاتە شایەنی خۆشەویستیی ئەو. بەپێچەوانەوە دەزانێت ئەو ژیانەی بە ئەنجامدانی حەرامەکان بەسەر دەبرێت لەبەر ئەوەی لەم ڕووەوە تەقدیری گەورەی پەروەردگار بە کەم تەماشا دەکرێت و گرنگیی پێ نادرێت، خاوەنەکەی دەکاتە شایستەی وەرگرتنی سزایەکی سەخت.

## پڕبوونی ژینگە لە حەرامەکان، لە گوناهی ڕوانین کەم ناکاتەوە

لە ئایەتێکی پیرۆزی سورەتی نووردا، لەو ئایەتەدا کە باس لە پاراستنی چاوەکان دەکات لە حەرام، فەرمان بەوە کراوە پیاوان و خانمانی ئیماندار چاوانیان لە حەرام بپارێزن. هەربۆیە کەس مافی ئەوەی نییە بە بەهانەی ئەوەی ژینگەکەی لێوانلێوە لە حەرام بڵێت "نابێت لەم سەردەمەدا تەماشاکردنی حەرام گوناهـ بێت!" یان "لەم سەردەمەدا ڕوانینی حەرام گوناهەکەی کەمترە!" ئەوەی لە بارەی ڕوانینی حەرامەوە لە ئێمە داوا دەکرێت لابردنی ئەو حەرامانە نییە کە دێنە بەر چاومان، بەڵکو پێویستیی پاراستنی چاوەکانی خۆمانە لەو حەرامانە. لەڕاستیدا زۆر جار و لە زۆر بابەتدا لە دەرەوە بە دوای هۆکاری ئەو هەڵە و گوناهانەدا دەگەڕێین کە ئەنجامیان دەدەین. کەچی چارەسەرەکە لە مرۆڤ خۆیدایە. ئیمانداری خاوەن ئیمانی پتەو گەر لەبەرامبەر ئەم حەرامانەدا لەرزەیەکیش بکات، وەرناگەڕێت. مرۆڤی ئیماندار بە هاوکاریی زۆرێك لە هەستەکانی وەك ئارامگری و پاکیزەیی و حەیا و پشتبەخوابەستن دەتوانێت لەم کارەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. بەڵام بە مەرجی ئەوەی لە خۆیدا بە دوای هۆکارەکەدا بگەڕێت و نەکەوێتە ئەوەی بڵێت "ژینگە خراپە، من چی بکەم!" حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَام) لەبەرامبەر ئەو ئافرەتەدا کە بە هەموو سەرنجڕاکێشیی خۆیەوە لەبەرامبەریدا وەستابوو چاوەکانی داخست و پشتی تێ کرد. لە جیاتی گۆڕینی ژینگەکە، ڕووی کردە ئەنجامدانی ئەرکی سەر شانی خۆی.

لەڕاستیدا لە فەرموودەی ئازیزماندا هاتووە پێمان دەفەرمووێت "گەر خراپەیەکمان بینی، دەبێت بە دەست یان بە زمان بی گۆڕین، گەر نەمانتوانی

پێویستە لە دڵەوە ئەو خراپەیەمان پێ ناخۆش بێت.“ بەڵام گۆڕینی خراپەکان بە دەست، زۆر جار کاری لایەنی پەیوەندیدار و بەڕێوەبردنە. هەر بۆیە ئەوەی دەکەوێتە سەر شانی ئێمە، بەپێی توانا هەوڵدانە بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی خراپە لە ڕێگەی زمانمانەوە، یاخود بە لای کەمەوە لە دڵەوە دوعا بۆ چاکبوونی ئەو دۆخە بکەین یان پێمان ناخۆش بێت.

هیچ کێشەیەك نییە تەنها بە فەرمانێك چارەسەربووبێت. ئەوەی گرنگە و چاوەکان لە حەرام دەگێڕێتەوە بوونی بزاوتی ناوەکی و هێزی ئیمانە. بەپێچەوانەوە گەر بە یاساکانی "سەر بۆ خوار" مەسەلەکە بە چارەسەرکراویش بێتە پێش چاو، هێشتا ئەو حاڵە خراپە لە قاتەکانی خوارەوە بەردەوامیی دەبێت. بەڵام کە تاك خاوەنی ئیمانێکی بەهێز بوو، لە هەرشوێنێکی دونیادا بێت چاوەکانی هەردەم لە حەرام دوور دەبن و بەم جۆرە بابەتەکە لە ڕەگەوە چارەسەر دەبێت.

کاتێك پیاوان چاویان لە حەرام گێڕایەوە، ئیدی کرانەوە و جلوبەرگی نابەجێی ئافرەتانیش کۆتایی پێ دێت. مەگەر ئەو حەز و ویستەی وا دەکات ئەوان بە جلوبەرگی کراوەوە لەسەر جادەکان بسوڕێنەوە چێژوەرگرتن نییە لە ڕوانینی پیاوان بۆیان؟

## ئەو زیانانەی ڕوانینی حەرام بە گەنجانی دەگەیەنێت

نیعمەتی گەنجێتی یەکێکە لەگرنگترین ئەو چاکانەی کە بە مرۆڤ بەخشراوە و بە بەهاری تەمەن دەژمێردرێت. ڕوانینی حەرامیش زیاتر لەم بەشەی تەمەندا دەبێت. لەبەر ئەوە لێرەدا دەمانەوێت ئاماژە بە چەند خاڵێك

بکەین کە بەدیعوززەمان تیشکی خستووەتە سەر لەمەڕ ئەو زیانە دونیایی و دوارۆژیانەی کە گوناهەکانی وەك ڕوانینی حەرام بە گەنجانی دەگەیەنن:

مامۆستا بەدیعوززەمان بۆمان بەیان دەکات کە پێویستە مرۆڤ هەرگیز زووئاوابوونی خۆری گەنجێتی لە یاد نەکات هەر وەك چۆن هاتنی خەزان و زستان لەپاش هاوین و ئاوابوونی خۆر و هاتنی شەو گومانیان تێدا نییە، گەنجێتیش بێگومان دواجار ڕێی خۆی بۆ پیری و مردن چۆڵ دەکات، کاتێك ئەو گەنجێتییە فانی و کاتییە لە بازنەی ئیستیقامەتدا و بەعیففەتەوە ڕاستەڕێی خێر وەردەگرێت، لە توانایدایە ببێتە گەنجێتییەکی هەمیشەیی. هەموو کتێبە ئاسمانییەکان و سەرجەمی پێغەمبەران مژدەی ئەم یاسایەمان پێ دەدەن. حەزرەتی بەدیعوززەمان ئاماژە بەوەش دەکات کە گەر نیعمەتی گەنجێتی لە چێژە حەرام و ڕێپێنەدراوەکاندا بەفیڕۆ بدرێت، لە هەشت ڕوانگەوە لەدەست دەدرێت، ئەمانەش دووانیان لە ژیانی دوارۆژدایە و شەشیشیان لە ژیانی دونیادایە.

## ٦. چاوت بپارێزە، تا دونیا و دوارۆژت پارێزراو بێت

## پێویستە چۆن لە پاراستنی چاو لە حەرام تێبگەین؟

دەکرێت پاراستنی چاوەکان لە حەرام لە سێ بەشدا کۆ بکەینەوە.

یەکەم: پارێزگاریکردنی موسڵمانی ئاسایی (عەوام) لە چاوەکانی بەرامبەر بە حەرامەکان. ئەمە گێڕانەوەی چاوەکانە لە ڕوانینی حەرام. ئەو ئایەتە پیرۆزانەی ئاماژە بۆ ئەمە دەکەن بریتین لەمانە:

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُولِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾

(النور: ٣٠-٣١)

"(ئەی پێغەمبەر) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها ناموس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکتر و پوختترە بۆیان (بۆ دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ڕۆح و لاشەیان) بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن.

بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و جوانیی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە (وەك دەم و چاو و دەست) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکی خۆیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕی خۆیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێك کە پەیوەندییان هەیە پێکەوە، یان کەنیزەکەکانیان (کە

لە بارودۆخی تایبەتدا هەبوون) یان ئەوانەی کە لە ماڵەکانتاندا دەژین و پێویستییان بە ئافرەت نییە (لەبەر پیری، یان نەخۆشی...هتد) یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەتان نییەو (ئارەزووی جەستەییان بۆ دروست نەبووە و نازانن باسی عەورات بکەن) نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەویدا (تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت کە زینەتدار و خشڵدارن، کەواتە هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خوا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ڕزگار و سەرفراز ببن."

دووەم: پارێزگاریکردنی خەواس (ئەو کەسایەتی و زاتانەی بە دینداری و ڕاستگۆییانەوە دەناسرێن و کار بە زانستەکەیان دەکەن و وەك خاوەن پلەی بەرزی مەعنەوی تەماشا دەکرێن) لە چاوەکانیان بەرامبەر بە حەرام. ئەمە پاراستنی چاوەکانە لە ماڵی بێنرخی دونیا و لە خۆشییە کاتی و ڕاگوزەرەکانی. ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴾ (طه: ١٣١)

"(ئەی ئیماندار) تۆ چاوەکانت مەبڕە ئەو ناز و نیعمەتەی کە هەندێك خەڵکمان لێ بەهرەوەر کردووە، کە زینەت و ڕازاوەی ژیانی دونیایە، بۆ ئەوەی لەو ناز و نیعمەتە تاقییان بکەینەوە، بێگومان ڕزق و ڕۆزیی پەروەردگارت (لە بەهەشتدا) چاکتر و بەردەوامترە."

سێیەم: بریتییە لە پارێزگاریی خەواسی خەواس (ئەوانەی کە گەیشتوون بە نهێنییەکانی قورئان و دونیای مەعنەوی و، لە ڕێگەی زانست و، پەرستش و لەخواترسیدا لە بەرزبوونەوەیەکی ناوازەدان و ئەو دۆستانەی خوان کە لە خەواس لەپێشترن) لە چاوەکانیان لەبەرامبەر ڕوانینی حەرامدا کە ئەمەش

دوورخستنەوەی هەستە بەرزەكان و نهێنییە پاراوەكانە لە چێژەكانی دونیای فانی. ئەم ئایەتە پیرۆزەش باسی دۆخی ئەم جۆرە كەسانەمان بۆ دەكات:

﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴾

(الأنعام: ٩١)

"(جولەكە) وەكو پێویست قەدری خوایان نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، چونكە وتیان: خوا هیچ كتێبێكی بۆ هیچ كەس دانەبەزاندووە، پێیان بڵێ: باشە ئەی كێ ئەو كتێبەی دابەزاند كە موسا هێنای (بۆتان)، لەكاتێكدا نوور و هیدایەتیش بوو بۆ خەڵكی، كەچی ئێوە بەش بەش و پارچە پارچەی دەكەن و ئەوەی بەدڵتان بێت نیشانی خەڵكی دەدەن و زۆریشی دەشارنەوە (بەتایبەت دەربارەی پێغەمبەر و قورئان) هەروەها بڵێ هەندێك شت فێركران كە نە ئێوە و نە باو و باپیرانتان نەتاندەزانی، پێیان بڵێ: هەر خوا خۆی دای بەزاندووە و فێریشی كردوون، لەوەودوا وازیان لێ بهێنە با لە بەتاڵ و نادروستیی خۆیاندا ڕۆ بچن و گەمە و یاری بكەن!!"

## سوودەكانی پاراستنی چاوەكان لە حەرام

١. نەزەرنەكردن لە حەرام، دڵ لە ئازاری حەسرەت ڕزگار دەكات. ئەوەی لە حەرام دەڕوانێت، بە دوای ڕێگادا دەگەڕێت تا پێی بگات. كاتێكیش پێی ناگات، بە تاسەیەكی گەورەوە هەوڵ دەدات ئەوە بەدەست بهێنێت كە لە خەیاڵیدایە.

٢. تەماشانەکردنی حەرام، نوور دەخاتە دڵەوە. ئەمەش لە چاو و ڕوخسار و ئەندامەکانی تری جەستەیدا دەردەکەوێت.

٣. پاراستنی چاوەکان لە حەرام، فیراسەت بە چاو دەبەخشێت کە میوەی نووری بەسیرەتە.

٤. پاراستنی چاوەکان لە حەرام، ڕێگا و دەرگاکانی زانست دەکاتەوە. ئەمەش بەو نوورەیە کە لە دڵدا دروستی دەکات. بەم نوورە کە لە دڵدا جێگیربووە و حەق و باتڵ لێك جودا دەکاتەوە، دۆزینەوەی چاکە و ڕاستی ئاسان دەبێت.

٥. هێزی دڵ و بەردەوامی و ئازایەتی دەداتە مرۆڤ. دەبێتە هۆکار بۆ دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لە سووکی و نزمی و کەمی و لاوازی گوناهی نەزەر. ئەوەش بە یادی مرۆڤدا دەهێنێتەوە کە خوا تاکە زاتە کە جێی سامی گەورەی مرۆڤ بێت.

٦. تەماشانەکردنی حەرام ئاسوودەیی و ئارامی و خۆشییەکی زۆر زیاتر لەو لەزەت و خۆشییە کاتییە دەداتە دڵی مرۆڤە کە تەماشاکردن دەیدات.

٧. دوورخستنەوەی چاوەکان لە حەرام، دڵ ڕزگار دەکات لەوەی ببێتە ئەسیری شەهوەت. کاتێك ئیبن تەیمییەیان خستە زیندانەوە لە بەرامبەر ئەوانەدا کە پێیان دەوت "دیل و زیندانی" وتی "دیلی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە بووەتە دیلی هەوا و هەوەسەکانی. بەندکراوی ڕاستیش ئەو کەسەیە کە خوا لە دڵیدا جێ ناکاتەوە."

٨. گێڕانەوەی چاوەکان لە حەرام، دەبێتە هۆی داخستنی یەکێك لە

دەرگاکانی دۆزەخ. چونکە سەرجەم دەرگاکانی دۆزەخ بۆ ئەوانەن کە بەشیان لە حەرامدا هەیە.

٩. نەڕوانین لە حەرام، مێشکی مرۆڤ بەهێز دەکات و پەرەی پێ دەدات. لاوازیی مێشك، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە بیر لە ئەنجامی کردەوەکان نەکرێتەوە. چارەسەری ئەمەش نەڕوانینە لە حەرام.

١٠. پارێزگاریی چاوەکان لە حەرام، دڵ لە مەستیی شەهوەت و زەلکاوی غەفڵەت دەپارێزێت و بەمەش ناهێڵێت خاوەنەکەی بکەوێتە نێو مەستیی غەفڵەت و عەشقەوە. گەر ڕوانین کاسەی شەراب بێت، عەشقیش خواردنەوەی ئەو شەرابەیە.

١١. گەر مرۆڤ بە نیەتی پابەندبوون بە فەرمانی خواوە لە حەرام بگەڕێتەوە، ئیدی هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژدا بەرزترین ئاستی خۆشی و ئاسوودەیی دەست دەکەوێت.

١٢. پاراستنی چاوەکان لە حەرام، دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی دڵ بە تیرێکی ژەهراوی بپێکرێت.

١٣. نەڕوانین لە حەرام، مرۆڤ دەگەیەنێتە ئاسۆیەکی وەها کە ببێتە دۆست و نزیکی پەروەردگار. بەڵام نەزەرکردن لە حەرام، لە خوا دووری دەخاتەوە و بەربەست دەخاتە نێوانیانەوە.

١٤. ئەو کەسەی لە حەرام ناڕوانێت، ئەو خاڵانەی دڵ دادەخات کە شەیتانی لێوە دزە دەکات. شەیتان وێنای ئەو دیمەنە حەرامە دەکات کە بینراوە و لە دڵدا دەیکێشێت، بەڵام گەر لە حەرام نەڕوانرێت ئەم دەرفەتەی نابێت.

١٥. پاراستنی چاو لە حەرام، وا دەکات دڵ ڕوو بکاتە ئەو کردەوانەی کە بەرەو بەهەشت دەیبەن. ئەو کەسەی کە بەردەوام لە حەرام دەڕوانێت، گرنگی بەمە نادات، هەربۆیە لە نێوان خۆی و بەهەشتدا پەردە دادەداتەوە و، فەرمانی خوا لە یاد دەکات.

## گەر چاوەکان لە حەرام نەپارێزرێن، چی ڕوودەدات؟

### زیان و لەدەستچوونە دونیاییەکان:

١. ئەو ئازاری "پەشیمانی"یەی کە لە چێژی حەرامدایە و لە تەواوبوونی ئەم چێژەوە پەیدا دەبێت و ئەو بەڵای "خەمباری"یەی کە لە کۆتایی هاتنییەوە لەدایك دەبێت، قوڵایی دڵمان دەسوتێنێت. چونکە گەر بۆ حەڵاڵبوونی چێژەکە ئارەقی ناوچاوان بڕێژین، ئەم ماندووبوونە و ئەم حەڵاڵییە دەچێتە حوکمی شوکرانەبژێریی مەعنەوییەوە، گەر لە ڕووکەشدا تەواویش ببێت، لە خەزێنەی پەروەردگاردا بەردەوامیی هەیە! هەریەك لەو نیعمەتانەی کە شوکرانە دەکرێن، نیعمەتێکی بەهەشتە، لە خەزێنەیەکی نەبڕاوەوە دێت، بەرەو خەزێنەیەکی نەبڕاوەش دەمانبات. بەڵام ئەو چێژانەی کە بێشوکرانەن و حەرامن، -لەبەر ئەوەی هەر هێندەن کە لە ڕووکەشدا هەن- زوو تەواو دەبن. ئازاری تەواوبوونیشیان زۆر لەو خۆشییە سەختترە کە چێژەکە دەیبەخشێت. لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە مرۆڤەکە دەڕوخێنێت و پەرێشانی دەکات.

٢. چێژی حەرام، گەر پێشێلی مافی خەڵکیشی تێدا بێت، وەك داخوازیی دادپەروەریی پەروەردگار، بێجگە لە باجە دوارۆژییەکەی باجێکی دونیاییشی دەبێت و لە شێوەی سزایەکی جیاواز و لە کاتێکی چاوەڕواننەکراودا لە

دەرگاکەمان دەدات. لێرەدا دەستوری "چی بچێنیت ئەوە دەدوریتەوە" کار دەکات. هەرچی چێژە حەلاڵەکانیشە، لەبەر ئەوەی مافی کەسەکە خۆین و بەری ڕەنجن، لە ئازار و کۆتاییەکی وەها بێبەرین.

٣. لە نێو چێژی حەرامدا ئازاری "ئیرمیی" هەیە. زۆر کاتیش دەبێتە هۆکار بۆ ڕووداوی سەخت و نەخوازراو و چاوەڕواننەکراو. هەرچی چێژە حەلاڵەکانیشە، لەبەر ئەوەی لەسەر بناغەی "ڕاستی" بنیاتنراون، لە بنەڕەتدا بەتاڵی و نارەزاییەکی وەهایان تێدا نییە تا ڕێ بۆ وەها ئازارێك خۆش بکات.

٤. لە نێو چێژی حەرامدا ئازاری "جودایی" هەیە. ئازاری "جودایی و فیراق" کە لە هەموو چێژ و خۆشییە دونیاییەکاندا هەیە، وێرانکارییەکی وەها لە ڕۆحی مرۆڤدا دەکات، بە جۆرێك ئەو چێژ و خۆشییە دەهێنێتەوە ژێر سفر. لە چێژە حەلاڵەکانیشدا، پشت بە خوا لەبەر ئەوەی دووبارە بەیەکگەیشتنەوە لە بەهەشتدا ڕوودەدات، گەر لە دونیاشدا جودایی ڕوویدات، جودایی ئەبەدی نییە.

٥. لە سروشتی چێژی حەرامدا ئازاری وەرنەگرتنی بەرامبەر و خۆشنەویستران هەیە. لە چێژە حەلاڵەکانیشدا، لەبەر ئەوەی پێشێلی حەق ناکرێت و میهرەبانی و ڕێزی دوو لایەنە کراوەتە بناغە، ئەم جۆرە ئازارانە بوونیان نابێت.

٦. چێژە حەرامەکان، لەسەر ڕۆحی مرۆڤ وێرانکارن. ڕۆح فرێ دەدەنە بەتاڵییەوە و، دڵ دەگرێنن و، ویژدان دەهەژێنن و، مێشکمان دووچاری لاوازی دەکەن و، هەستەکان دەپوکێننەوە و، مرۆڤیش دەخەنە گێژاوەوە. هەرچی چێژە حەلاڵەکانیشە، لەبەر ئەوەی پشتیان بە مۆڵەت و دەرفەتێکی خوای گەورە

بەستووە، لە بنەڕەتدا ئەو توخمانە لەخۆ ناگرن کە ڕێ بۆ وێرانکارییە ڕۆحییەکان خۆش دەکەن.

هەموو ئەم ئازار و ناخۆشی و ناتەواوییانە، چێژە بەشییەکانی خۆشییە حەرامەکان دادەبەزێننە حوکمی هەنگوینێکی ژەهراوییەوە. لەڕاستیدا هاوتای سەرجەم چێژە حەرامەکان لە بازنەی حەڵاڵدا بوونیان هەیە. بازنەی حەڵاڵ فراوانە، بۆ کەیف و خۆشیمان بەسە. پێویست بە چوونە نێو حەرام ناکات. فەرمانەکانی پەروەردگاریش کەمن.[1]

## لەدەستدانەکانی دواڕۆژ

١. بەرپرسیارێتی دواڕۆژ. چێژە حەرامەکانی گەنجێتی گەر تەوبەیان لەسەر نەکرێت، لە مەحشەر و دادگای گەورەی پەروەردگاردا دەبێتە هۆکار بۆ پەشیمانی بێگەڕانەوە. چونکە ئەو کات جەنابی "اللّٰه" لەسەر نیعمەتەکانی لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکات. گەنجێتییەکی بێشوکرانەبژێری و لێوانلێو لە حەرام، لەوێ تەنها خەجاڵەتیمان تووش دەکات، ڕوخسارمان سوور هەڵدەگەڕێنێت و، سەرمان بۆ ئەرز شۆڕ دەکات.

٢. سزای گۆڕ، زیانێکی تری دواڕۆژییە. ئەو گەنجێتییەی بە حەرام و گوناهەکان چنراوە، بانگهێشتی سزای گۆڕ دەکات.

١. تیشکەکان، لا. ١٨٦؛ عەصای موسا، لا. ٢٢؛ وتەکان، لا. ٣٣.

## جولەیبیب

ڕۆژێکیان گەنجێك دێتە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). دۆخێکی نارەحەتی پێوە دیاربوو. وتی " ئەی نێردراوی خوا، مۆڵەتم بدە زینا بکەم. چیدی ئارامم نەماوە."

ئەوانەی لەوێ بوون بەم داواکارییەی ئەم گەنجە زۆر تووڕەبوون. لەکاتێکدا هەندێکیان بەتوندی سەرزەنشتیان دەکرد، هەندێك خەریکبوو هەڵدەستان هێرشیان بۆ دەبرد تا بێدەنگی بکەن. تەنانەت کەسانێك بۆ تێسرەواندنی لە شوێنی خۆیان ڕابوون.

بەڵام ئەو پێغەمبەرە خاوەن شەفەقەتە، لەگەڵ ئەوەی ڕێگەی بە هیچ کام لەمانە نەدا، بێدەنگبوو و گوێی بۆ گەنجەکە ڕادێرا. دواتر بانگی کردە لای خۆی و پێی فەرموو:

"ئایا دەتویست شتێکی وەها لەگەڵ دایکی تۆدا ئەنجام بدرێت؟"

گەنجەش لە وەڵامدا وتی:

"دایك و باوکم بە فیدات بن ئەی نێردراوی خوا! بێگومان نەمدەویست."

پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرمووی:

"هیچ مرۆڤێك نایەوێت شتێکی وەها لەگەڵ دایکیدا ئەنجام بدرێت."

پاشان پرسی:

"باشە ئەی ئەگەر تۆ کچێکت هەبووبا، دەتویست شتێکی وەهای لەگەڵدا بکرێت؟"

گەنجەکە بەم جۆرە وەڵامی دایەوە:

"گیانم بە فیدات بێت ئەی نێردراوی خوا، نەمدەویست."

بۆچی [illegible] بەریرم؟

پاشان نازیز فەرمووی:

"هیچ مرۆڤێك نایەوێت شتێکی وەها لەگەڵ کچیدا ئەنجام بدرێت."

لەپاش ئەمەش دیسان پرسی:

"ئایا دەتویست شتێکی وەها لەگەڵ پورتدا ئەنجام بدرێت؟"

گەنجەکە لە وەڵامدا وتی:

"نەخێر ئەی نێردراوی خوا!"

پێغەمبەری خوا پرسی:

"ئایا دەتویست کەسێك زینا لەگەڵ خوشکەکەتدا بکات؟"

گەنجەکەش وتی:

"نەخێر! نەخێر نەمدەویست!" پاشان نازیزمان بەم شێوازە بەردەوامبوو لە فەرمایشتەکانی:

"هیچ کەسێك نایەوێت لەگەڵ کچ و دایك و پور و خوشکیدا زینا ئەنجام بدرێت." دواتریش دوعای بۆ ئەو گەنجە کرد و فەرمووی:

"پەروەردگارا! لە گوناهی خۆش ببە، دڵی خاوێن بکەوە و داوێنپاکی بکە."

هەندێك لە ڕاوییەکان دەڵێن کە ئەو گەنجە جولەیبیب بووە. وەك کەسێك ناسرابوو کە جڵەوی نەفسی خۆی بۆ نەدەگیرا و لەنێو هاوەڵاندا ناوبانگێکی باشی نەبوو. بەڵام لەپاش ئەم دیدارەی لەگەڵ نازیزماندا، بووە کەسێکی تەواو خاوێن. لەکاتێکدا پێشتر کەس نەیدەویست کچی بداتێ، بە هاوکاری پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَام) توانی هاوسەرگیریش بکات. پاش ماوەیەکی کەمیش لە هاوسەرگیری، لە یەکەمین جەنگدا شەهیدکرا.

لە کۆتایی جەنگەکەدا ئازیزمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە هاوەڵانی پرسی:

"ئایا کەسمان کەمە؟" لە وەڵامدا فەرموویان:

"نەخێر ئەی نێردراوی خوا، تەواوین!"

ئازیزمان فەرمووی:

"بەڵام من یەکێکم کەمە" پاشان چووە لای سەری جولەیبیب و فەرمووی "جولەیبیب لە منە و، منیش لە جولەیبیبم."[1]

---

١. مسلم، فضائل الصحابة ١٣١.

# چۆن چاوەکانم لە حەرام بپارێزم؟



پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی:

"بێجگە لەم سێ چاوە، هەموو چاوێك لە ڕۆژی قیامەتدا دەگری، ئەو چاوانەش ئەمانەن:

١. ئەو چاوەی خۆی لە تەماشاکردنی ئەو شتانە بەدوور دەگرێت کە خوا حەرامی کردوون.

٢. ئەو چاوەی کە لە ڕێگای خوادا بێخەو ماوەتەوە.

٣. ئەو چاوەی لە ترسی خوای گەورە گەر هێندەی سەری مێشولەیەکیش بێت، فرمێسک دەڕێژێت."

## خاڵی سەرەتا: ڕوانین

تەماشاکردنی حەرام داوەتنامەی زینایە. ئەو کاتەی چاوەکان دەخزێنە حەرامەوە ئیرادە بێبڕیار دەمێنێتەوە و عەقڵیش دەبێتە گوێڕایەڵ و ئامادە بۆ فەرمانەکانی نەفس. ئەو نەفسەی کە چاوی بەرەو حەرام خزاند، تا کۆتایی ئەم ڕێبوارییەی زینا ناگاتە ئارامی و هەردەم داوای زیاتر دەکات.

لە سورەتی (الإسراء)دا خوای پەروەردگار پێمان دەفەرموێت "لە زینا نزیک مەبنەوە" بۆیە ئەوەی پێویستە ئاگاداری بین ئەنجامنەدانی زیناکە نییە، بەڵکو نزیکنەبوونەوەیە لێی. ئەو کردارەی کە یەکەمین هەنگاوی نزیکبوونەوە پێك دەهێنێت، تەماشاکردنە. لەو ساتەوەی ئەم لێوارە تێ دەپەڕێنرێت، ڕێبواریی ڕێی زینا بەردەوام دەبێت. ئیدی نازانرێت شەیتان کە وەك خوێن لە دەمارەکانی مرۆڤدا دێت و دەچێت کەی دەیوروژێنێت و، خوێنی جۆش دەدات و هەوا و هەوەسی دڕندانەی دەخاتە گەڕ. مرۆڤ لە ساتی ڕوانینییەوە بۆ ڕێبوارییەك دەکەوێتە ڕێ کە گەڕانەوەی نییە. لەبەر ئەمە ئەوانەی لێواری ڕوانینیان تێپەڕاندووە هەردەم ئەگەری ئەوەیان هەیە بکەونە نێو زیناوە.

لە یاساکانی فیقهیشدا حەرامبوونی ئەو ڕێگایانە چەسپاوە کە دەچنەوە سەر حەرام. ئازیزمان (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی داوە کاتێك بە بەردەم مەجلیسی مەیخۆراندا ڕەت دەبین چاویان تێ نەبڕین. لەبەر ئەوەی ڕەنگە ئەوەی تەماشایان دەکات سەرنجی ڕابکێشن و لایان دابنیشێت، دواتر گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات و، پاشان تامێکی مەیەکە بکات و مەست ببێت دواتر ئالودە ببێت و تەنانەت وای لێ بێت مەی وەك "موباح"ێك تەماشا بکات.

حەرامکردنی ئەو ڕێیانەی دەچنەوە سەر حەرام بێگومان سەرجەم حەرامەکان دەگرێتەوە. دیارە کە ڕوانینی زیناکارانە مرۆڤ دەباتەوە سەر زینا، هەربۆیە بەپێی سەرئەنجام، هەموو ئەو ژینگانە حەرامن کە مرۆڤ بە ڕوانینی زیناکارانە دەگەیەنن. وەك چۆن سەرجەم ئەو هەنگاوانەی بە ئاڕاستەی مزگەوتدا هەڵدەنرێت دەبنە هۆکاری دەستخستنی پاداشت، بە هەمان شێوە هەنگاوەکانی ئاڕاستەی گوناهیش پێچەوانەکەیەتی.

# بۆ نەڕوانین لە حەرام، پێویستە ئەمانە بزانین

* ڕوانینی حەرام دڵەکان ڕەش دەکات. نەزەری حەرام وەك یەکێك لە تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان، دەمانکاتە یەکێك لە نێچیرەکانی شەیتان. ئیمامی ڕەببانی دەفەرمووێت ''حەرامەکان وەك پیسی ڕووپۆشکراو وەهان''. دەرەوەی جوانە بەڵام ناوەوەی پیسە. بە بیرکردنەوە لەمە، دەبێت لە حەرام نەڕوانین.

* بە وەبیرهێنانەوەی ئەو فەرموودەیەی ئازیزمان کە دەفەرمووێت ''لەعنەتی خوا لەو کەسەی شوێنی عەورەتی دەردەخات و لەوەش کە تەماشای دەکات'' بۆ ئەوەی نەبینە لەعنەتلێکراو، پێویستە چاوەکانمان لە حەرام بەدوور بگرین.

* بە وەبیرهێنانەوە و تێفکرین لە فەرموودەی ''خوای پەروەردگار چێژی پەرستش دەداتە ئەو کەسەی لە ترسی سزای خوای گەورە ڕووی لە ئافرەتی بێگانە وەردەگێڕێت''، پێویستە بۆ گەیشتن بە چێژی پەرستشەکان چاوەکانمان لە حەرام بگێڕینەوە.

* پێویستە بە وەبیرهێنانەوەی فەرموودەی پیرۆزی ''ئەو کەسەی بە شەهوەتەوە لە ئافرەتان دەڕوانێت، لە دواڕۆژدا قوڕقوشمی تواوە دەکرێتە چاویەوە و دەخرێتە دۆزەخەوە'' سڵ لە سیفەتی تووڕەیی خوای گەورە بکەینەوە.

* دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ئەو ئافرەتانەی لێیان دەڕوانین دایك، خوشك، کچ، یاخود خێزانی کەسێکن، بۆیە نابێت شتێکمان بۆ خەڵکی بوێت کە بۆ خۆمان هەرگیز قەبووڵمان نییە.

* دەبێت ئەوە بزانرێت کە پاراستنی چاوان لە حەرام پێویستی بە ئارامگرتنە.

لەم بابەتەدا مامۆستا فەتحوڵڵا گولەن ئەم شیكارییانەمان بۆ دەكات:

"پێویستە مرۆڤ لەبەرامبەر حەرامیشدا هەمان ئارامگری بنوێنێت. ئەو بەرگرییەی كە هەر لە یەكەم سەردەرهێنانی گوناهەوە ئەنجام دەدرێت، ئەو پریشكە خراپانە تێكدەشكێنێت كە لێیەوە دێن و، بەم جۆرە مرۆڤیش ئەو شۆكە تێدەپەڕێنێت. لەبەر ئەمەیە كە ئازیزمان بە حەزرەتی عەلی دەفەرمووێت "لە یەكەمین ڕوانین دەبەخشرێیت، بەڵام دووەم ڕوانین قابیلی لێخۆشبوون نییە"[1] واتە، ڕەنگە چاوی مرۆڤ بخزێتە سەر گوناه. بەڵام گەر ئەو دەستبەجێ چاوی دابخات و، ڕووی وەربگێڕێت، بە گوناه ئەمەی بۆ نانووسرێت. تەنانەت ڕەنگە لەبەر ئەوەی لە حەرامی نەڕوانیوە پاداشتیشی بۆ بنووسرێت. بەڵام ڕوانینی دووەم و ڕوانینەكانی دواتر هەر یەكەیان وەك تیرێكی ژەهراوی، دڵ و ڕۆحی مرۆڤ دەپێكێت و، لە خەیاڵی مرۆڤدا گێژاو دێنێتە ئاراوە. ئەو كەسە هەڵكشانی مەعنەوی ئیرادەی لەدەست دەدات. لەبەر ئەوەی هەر ڕوانینێكی حەرام، بە جۆرێك لە جۆرەكان لە حوكمی داوەتنامەیەكدایە كە ڕێگاكانی چوونە نێو حەرام ئاسان دەكات. بەم جۆرە هەر ڕوانینێك، بانگهێشتی ڕوانینێكی تر دەكات. ئیدی ئەو مرۆڤە دەست دەداتە حەرام و بۆ ڕێبوارییەك دەكەوێتە ڕێ كە گەڕانەوەی زۆر سەختە. بۆیە پێش گەیشتن بەم حاڵە و، ئارامگرتن و ڕووومرچەرخان لە حەرام هەر لە یەكەم دەركەوتەیدا، یەكێكە لە ڕێنوێنییە زێڕینەكانی پێغەمبەری خوا بۆ ئێمە.

ئەپیكتێتۆس قسەیەكی هەیە دەڵێت "كاتێك خولیا خراپەكان لە خەیاڵەكانتدا دەتگرن، هەوڵ بدە لە یەكەم دەرفەتدا هەڵبێیت. گەر نا دواتر ناتوانیت لەو شوێنە بگەڕێیتەوە كە بردوویانیت." ئەم دەربڕینەی ئەو پڕە لە ئیلهام. گەر

١. الترمذي، الأدب ٢٨؛ أبو داود، النكاح ٤٢.

لەپاش پێغەمبەری خوا ژیابا، بەدڵنیاییەوە دەمانتوانی بڵێین کە ئیلهامەکەی لە پێغەمبەری خواوە وەرگرتووە.

کاتێك مرۆڤ بەردەوام دەبێت لەم جۆرە مامەڵەیە بەرامبەر بە حەرام، ئەمە لەودا دەبێتە خوو، دەبێتە کارەکتەری. چونکە ئەو نووری ئیمانەی بە ئەنجامدانی ڕاهێنانەکان لە دڵیدا دەستی کەوتووە، دەبێتە بەربەستێك لەبەرامبەر ئەو گوناهانەدا کە لە حوکمی پزیشکی دۆزەخدان. بە جۆرێك، ئیدی نەڕوانین لە حەرام، دەچێتە ڕیزی ڕەفتارە سەرەکی و فیترییەکانییەوە. گەر شتێکی پێچەوانە بە مێشکیدا بێت، دەستبەجێ پەنجەی دەکات بە هەنگوینی ئیمانی نێو شانەی دڵیدا و لە سایەی ئەم بیرۆکە پتەوەدا و لەگەڵ ئەو عەشقەدا کە تامی کردووە، لە هەموو ئەو شتانە هەڵدێت کە لەم فەزا مەعنەوییە دووری دەخەنەوە. ئەو مرۆڤەی لە دۆخێکی وەهادایە، زۆر چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکرێت بە شێوەیەکی ئیرادی بکەوێتە نێو گوناهەوە.[١]

## دەرمانەکانی پاراستنی چاوەکان

بۆ ئەوەی بتوانین چاوەکان لە حەرام بگێڕینەوە و، جڵەوی چاو و هەست و لایەنە ناسکەکانمان بگرینە دەست، پێویستە ئەم سێ شتە بکەینە فەرمانڕەوا بۆ سێ شتی تر: ڕۆح بۆ جەستە و، دڵ بۆ نەفس و، عەقڵیش بۆ گەدە. تەنها بە پابەندبوون بەم یاسایە دەتوانین بەرپەرچی ویستەکانی نەفسمان بدەینەوە کە بەردەوام فەرمان بە خراپە دەکات.

---

١. م. فەتحوڵڵا گولەن، نووری نەمر-١.

* تا بکرێت دووربکەوینەوە لە ژینگە حەرامە ڕاستی و ئەلەکترۆنییەکان. بە دەربڕینێکی تر باشترین ڕێگا بۆ پاراستنی چاوەکان لە حەرام، گرتنی کون و کەلەبەرەکانی شەهوەتە.

* تا بکرێت ئەو خواردنانە کەم بکەینەوە کە نەفس و شەهوەت دەهەژێنن. ڕۆژووگرتن. پێغەمبەری خوا ڕێنوێنیی گەنجان دەکات گەر لە توانایاندا بوو، هاوسەرگیری بکەن گەر نا، ڕۆژوو بگرن.

* جڵەوکردنی ژینگەکەمان و، بەردەوامبوون لەگەڵ ئەو کەش و شوێن و ژینگانەدا کە مرۆڤ بۆ خێر ئاڕاستە دەکەن.

* گروپی هاوڕێیانمان لەو مرۆڤانە پێکبهێنین کە هانی خراپەمان نادەن و، بەرەو چاکە ئاڕاستەمان دەکەن. هەستان و دانیشتن لەگەڵ ئەو مرۆڤانەی کە خۆشبەختی هەردوو دونیایان کردووەتە ئامانجیان.

* تەوبەکردن، پەناگرتن بە خوای گەورە لە چاوی بەدکار و، نزا و پاڕانەوە لە لای ئەو تا لە زەلکاوی گوناهـ بمانپارێزێت.

* ڕوانینی حەرام گوناهێکی چەندە جددیش بێت، نابێت دەرفەتی شەیتان بدەین لە لای ڕاستەوە بۆمان بێت، پێویستە ئومێدی لێخۆشبوونمان لەدەست نەدەین و، بەردەوام ڕوو بکەینە میهرەبانیی لەبننەهاتووی پەروەردگار و تەوبەی نەسوح بکەین کە چیدی نەچینەوە سەرگوناهە کۆنەکانمان.

* کاتێك ڕووبەڕووی حەرام دەبینەوە، ئەوە بهێنینەوە یاد کە کوتایی هاتنی چێژەکەی ئازارێکی گەورە دەداتە نەفس.

* کاتێك چاوان بەر حەرام دەکەون، بیهێنینەوە یادی خۆمان کە دەبێتە

مایەی شکانی زۆرێك لە چێژ و نمرە مەعنەوییەکانی دڵ و ڕۆح و دەستبەجێ ڕوومانی لێ وەربگێڕین.

* تا بکرێت لە زووترین و گونجاوترین کاتدا هاوسەرگیری ئەنجام بدەین. هاوسەرگیری یەکێکە لە کاریگەرترین ئەو ڕێگیانەی کە یارمەتی پاراستنی چاوەکان دەدات لە حەرام.

* بیر لە مردن بکەینەوە و ئەوەمان لە یاد نەچێت کە لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێت.

* کاتێك چاوان دەچنە سەر حەرام، بیر لەوە بکەینەوە پەروەردگار لە بەهەشتدا کۆمەڵە نیعمەتێکی وەهای بۆ ئامادە کردووین کە "چاوەکان نەیانبینیوە و، گوێیەکان نەیانبیستووە و بە بیری هیچ مرۆڤێکیشدا نەهاتووە"، بەم جۆرە ئەوەمان بۆ ڕوون ببێتەوە کە لەبەرامبەر هەموو ئەمانەدا خۆسەرقاڵکردن بە چێژە کاتی و ساتییەکانەوە چەندە شتێکی بێبەها و هەرزانە.

* باوەڕمان بەوە هەبێت کە مرۆڤ بۆ ئەوەی ببێتە بەندەیەکی باش پێویستی بەوەیە چاوەکانی لە حەرام بپارێزێت و، گەر چاوانیشی چوونە سەر حەرام دەبێت لاپەڕەیەکی نوێ هەڵ بداتەوە و بەو جۆرە بەردەوامی بە ژیانی بدات.

* دەرك بەوە بکەین کە حەڵوای پێشکەشکراوی دەستی ئافرەتی چێژبەخش ژەهری تێدایە و، گەر سەرەتا چێژیشی لێ وەر بگرین، دواتر سکمان پێی دەئێشێت.

* دەرك بەوە بکەین کە چێژە حەرامەکان ڕاگوزەرن و کۆتایی دێن.

* بزانین كە ئەو حەرامەی لێی دەڕوانین هی ئێمە نییە و، كاتێك لێی جودا بووینەوە ئازارمان دەدات.

* بیر لەو ناخۆشییە بكەینەوە كە گەر بە هەمان چاوەوە تەماشای خێزان و منداڵ و خزمانمان بكرێت هەستی پێ دەكەین.

* بەبێ ئەوەی بڵێین "خۆ بە یەك جار تەماشاكردن هیچ نابێت" پێویستە لەم بابەتەدا جددییەتێكی گەورە بنوێنین.

* بەو كردەوانەوە سەرقاڵ ببین كە مرۆڤ لە پەروەردگار نزیك دەكەنەوە.

* لەو دۆخانە دووربكەوینەوە كە تووشی فشاری دەروونیمان دەكەن. ئەم جۆرە دۆخ و ژینگانە شەهوەت دەكاتە ئامانج.

* هەوڵ بدەین لە بەهای سامكردن لە پەروەردگار تێ بگەین و، كتێب لەسەر ئەم بابەتە بخوێنینەوە.

* زۆرنەخواردن. فەرموودەی "مرۆڤایەتی دەفرێكی پڕ نەكردووە نەگریستربێت لە گەدەی" بهێنینەوە یادی خۆمان و كۆتایی بەو زۆرخواردنە بهێنین كە نەفسمان بۆ خراپە جۆش دەدات.

* خۆمان لەو خووڕەوشتە خراپانە بەدوور بگرین كە نەفسمان دەبزوێنن.

## ئەنجامدانی هاوسەرگیری

تەماشاكردنی حەرام زیاتر لە گەنجاندا دەبینرێت و لە تێرنەكردنی هەستە شەهوانییەكانەوە سەرچاوە دەگرێت. ئارەزوو و هەوا و هەوەسەكانی مرۆڤ

و بەتایبەتیش گەنج، بەردەوام پاڵی پێوە دەنێن تا لەسەر ڕێی ڕاست دەری بکەن. پێغەمبەری ئازیزیش هاوسەرگیری بە چاك دەزانێت بۆ کەسانی نێو ئەم دۆخە. ئەوانەش کە توانای هاوسەرگیرییان نییە، ئامۆژگارییان دەکات ڕۆژوو بگرن.

عەلقەمەی کوڕی قەیس دەگێڕێتەوە: جارێکیان لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دا پیاسەمان دەکرد. پێی وتم: جارێکیان کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ''ئەوەی توانا و ئیمکانیەتی هاوسەرگیریی هەیە با یەکسەر هاوسەرگیری ئەنجام بدات. چونکە هاوسەرگیری کاریگەرترین ڕێگایە بۆ پاراستنی چاو و ناموس لە حەرام. ئەوانەش کە توانای ئەومیان نییە هاوسەرگیری بکەن، با ڕۆژوو بگرن. چونکە ڕۆژوو شەهوەتی مرۆڤ دەشکێنێت.''[١]

هاوسەرگیریکردنی درەنگی کوڕان و تەنانەت هاوسەرگیریی هەندێك لە تەمەنێکی زۆر درەنگدا، کارێکی ڕاست نییە. لەکاتێکدا کە ئوممەت تووشی فەساد هاتووە و، لەم چاخەدا کە خۆپاراستن لە گوناه بووەتە کارێکی سەخت، هاوسەرگیریکردنی زووی ئەوانەی کە لە توانایاندایە، هەم چاو و ناموسیان دەپارێزێت و هەم لەو کێشانەش دووریان دەخاتەوە کە هاوسەرگیریی درەنگ لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێت. ئەوەی هاوسەرگیریی کردووە پێویستییەکانی لەگەڵ هاوسەری خۆیدا بەجێ دەهێنێت، بەڵام ئەوەی هاوسەرگیریی نەکردووە مەترسی ئەوەی لەسەرە بکەوێتە نێو حەرامەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە لەم ڕووەوە بە باش دەزانرێت گەنجان تا بکرێت زوو هاوسەرگیری بکەن، لە هەمان کاتدا ڕێنوێنی ئەوە دەکرێن ڕێگای تریش بدۆزنەوە بۆ جڵەوکردنی ئارەزووەکان و،

١. بخاري، النكاح ١٠؛ مسلم، النكاح ١؛ أبو داود، النكاح ١؛ الترمذي، النكاح ١.

ساڵەکانی بەهاری گەنجێتیی تەمەنیش بۆ خزمەتکردنی ئایین تەرخان بکەن.

گەر کەسانێك نەتوانن هاوسەرگیریش ئەنجام بدەن، ئازیزمان ڕێنوێنی ئەوەیان دەکات بەڕۆژوو ببن. چونکە ڕۆژوو هێزی فیزیکی و ماددی مرۆڤ دەشکێنێت. گیرۆدەیی گەدەیەکی پڕ بۆ شەهوەت، زۆر زیاترە لەو گەدەیەی کە برسییە. لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییەدا کە ئەو ڕۆژووەی بۆ ڕەزامەندیی پەروەردگار گیراوە دەیهێنێت، مرۆڤ دەتوانێت هەستە نەفسانی و شەهوانییەکانی جڵەو بکات و بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

## چۆن چاوەکانم لە ماڵەوە دەپارێزم

پارێزگاریکردنی مرۆڤ لە چاوەکانی لە ماڵەوە، لە لایەکەوە ئاسانترە و لە لایەکی ترەوە سەختترە. ئاسانە چونکە ڕێژەی ئەو دیمەنە زیانبەخشانەی بەرچاوی دەکەون، هێندەی ئەوانەی دەرەوە نییە. سەختە چونکە ئەگەری ئەوەی هەیە هەر کاتێك بۆی ڕەخسا، لە ڕێگەی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر و تەلەفزیۆنەوە چاوی بەو بێنابڕووییانە بکەوێت کە لە دەرێشەوە نایانبینێت.

لەڕاستیدا ئەم دۆخە کاری ئیرادەیە. ئەو مرۆڤەی بڕوای بەوە هێناوە کە تەماشاکردنی حەرام زیانبەخشە، گەر نەفسیشی بیەوێت تەماشای ناکات. گرنگ ئەوەیە مرۆڤ لە ویژدانی خۆیدا زۆر بە باشی درك بەوە بکات کە نەزەری حەرام ناڕەحەتی و مەینەتییەکی زۆر لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت و، زیانە سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و خێزانی و ئایینییەکانی بزانێت. تا مرۆڤ خاوەنی تێگەیشتنێکی وەها بێت، لەم بابەتەدا ماڵەوە و شەقام و هەرشوێنێکی تر جیاوازییەکی ئەوتۆیان بۆ ئەو نابێت.

بەڵێ، گەنجان بەتایبەتی لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە لە ناو ماڵەکاندا ڕووبەڕووی مەترسی بینینی چەندین ماتریاڵی نەخوازراو دەبنەوە. بەم مانایە ئینتەرنێت مرۆڤ بەرەو کەندەڵانێکی وەها دەبات کە هیچ شتێکی تر نەیبردووە. چونکە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە گەر بویسترێت و بڕەخسێت، مرۆڤ دەستی بە لادانی زایەندی و ماتریاڵی زۆر نەشیاو و نابەجێدا دەگات و ئەمەش کاریگەریی زۆر خراپ لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و دەروونی مرۆڤەکان جێدەهێڵێت. لە دونیایەکی زۆر جیاواز لە دونیای ڕاستەقینەدا و لە "دونیای ئەلەکترۆنی"دا پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت. زۆر تایبەتمەندیی نێوان کەسەکان وەك دووری و تەمەن و ڕەگەز و نەتەوە و کەلتور و... هتد کە ڕەنگە لە دونیای ڕاستیدا گرنگ بن، لەو نێوەندەدا بزر دەبن.

بەم مانایە بۆ نەکردنەوەی ماڵپەڕە زیانبەخشەکانی ئینتەرنێت، پێویستییەکی زۆر بە بەرنامەکانی فیلتەرکردن و پاراستنی خێزان هەیە. لەبری ئەوەی لەبەر لایەنە نەرێنییەکانی ئینتەرنێت، کۆمپیوتەر لاببەین، پێویستە لایەنە نەرێنییەکانی لەناو ببەین، یەکەمین مەرجیش بۆ ئەمە هوشیاریمانە.

دەبێت زۆر باش لەوە تێبگەین کە "ئالودەیی ئینتەرنێت" نەخۆشییە و بەدڵنیاییەوە پێویستیی بە چارەسەرکردن هەیە. کاتێك تەماشایەکی چواردەورمان دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە خۆمان یان دۆستێکی زۆر نزیکمان لە سنووری ئالودەییدایە.

بەڵێ، یەکێك لە گرنگترین هۆکارە مەترسیدارەکانی ئینتەرنێت دەستکەوتنی ماتریاڵە بەدڕەوشتییەکانە بە شێوازێکی بێسنوور. گیرۆدەیی

دیمەنە بەدڕەوشتییەكان لە تەمەنێكی منداڵیدا، ڕەنگە كاریگەریی نەرێنی لەسەر گەشەی سۆز و جەستەیی منداڵان دابنێت. ئەمە فاكتەرێكی مەترسییە بەتایبەت بۆ منداڵی ئەو دایك و باوكانەی كە شارەزاییان لە سەلامەتی و كۆنترۆڵكردنی بەكارهێنانی ئینتەرنێتدا نییە. لەبەر ئەوە بۆ بەرگرتن لە بەكارهێنانی نادروست، پێویستە خێزان لەگەڵ منداڵەكەدا هەماهەنگی بكات و لەگەڵ هاندانیدا بۆ بەكارهێنانی بەسوود، سیستەمێكی كۆنترۆڵكردن دروست بكات.

توێژینەوەكان دەریانخستووە كە كوڕانی گەنج لەسەدا هەشتای بەكارهێنەرانی ئینتەرنێت پێك دەهێنن و بەتایبەت ئەم گروپەش كاتێكی زۆر لەو ماڵپەڕانەدا بەسەر دەبەن كە دیمەنە بەدڕەوشتییەكانی تێدا بڵاو دەكرێتەوە. وەك دەزانین، ئەم جۆرە خووانە فاكتەرێكی گرنگن لە ئالودەیی ئینتەرنێتدا.

نابێت ئەوەمان لە یاد بچێت كە "سەرجەمی گوناهەكان و تێكچوونە ڕەوشتییەكان، بە تەماشاكردنی دیمەنە نابەجێكان دەست پێ دەكەن و، بەردەوامبوون لەم تەماشاكردنە، فشار زیاد دەكات و پاشانیش گوناهی كرداری دەهێنێتە ئاراوە. لە لایەكی ترەوە چاوەكان وێنەی ئەو شتانە دەگرێت كە بینیونی، دەیانخاتە نێو خەیاڵیەوە. ئیدی وای لێ دێت بۆ هەركوێ بڕوات و لە هەرچی بڕوانێت ئەو وێنانە لەسەر پەردەی خەیاڵی لەبەرچاویدان. بەم جۆرە پاشكەوتن لەم گەنجەدا دەست پێ دەكات. گەر قوتابی بێت ناتوانێت خەیاڵ بداتە وانەكانی، گەر كارمەند بێت ناتوانێت پیشەكەی وەك پێویست بە ئەنجام بگەیەنێت، گەر پیاوی فیكر و بیرمەندی بێت ناتوانێت بیر و مێشكی كۆ بكاتەوە. بەم شێوەیە ئەوانەی خەیاڵیان داوەتە دیمەنە بەدڕەوشتییەكان لە هەموو بابەتێكدا پاشكەوتن و پەككەوتن بە خۆیانەوە دەبینن."

ئەو زیانانەی کە دیمەنی ڕووت لە مێشکدا دەیهێنێتە کایەوە بریتین لەمانە: خانەکانی چاکە لە مرۆڤدا دەکوژێت. شەهوەتی دەبزوێنێت. ورەی دەڕوخێنێت، دەبێتە ڕێگر لەبەردەم دوعاکردنیدا. ڕێزی مرۆڤ بەرامبەر بە خۆی کەم دەکاتەوە. وای لێ دەکات متمانەی بە هێزی ئیرادەی خۆی نەمێنێت. توانستی مێشکی لاواز دەکات. دڵ سەرقاڵ دەکات و وای لێ دەکات تاریکی ڕووی تێ بکات.

شەهوەت وەك ئەمانەتێك بە مرۆڤ بەخشراوە. پێویستە لە ڕێگەی ڕێپێدراوەوە تێر بکرێت. جوانترین ڕێگای ئەمەش هاوسەرگیرییە.

ئەم جۆرە دیمەنە ناشرینانە، نهێنیی ئەو هاوسەرگیرییەش کەم دەکەنەوە کە لە ئایندەدا ئەنجام دەدرێت. ئەو عەقڵەی کە لە هەموو خراپەیەك پارێزراوە، کاتێك سەرجەم ئەم زیانانە لەبەرچاو دەگرێت، فەرمانی ئەوەمان پێ دەکات لەم جۆرە دیمەنانە دوور بکەوینەوە. ئێوەش تەقەلا بدەن لەم جەنگە دەستەویەخەیەی تاقیکردنەوەی ئیرادەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنن. لە یادتان نەچێت کە ئەمە ململانێی مرۆڤە لەگەڵ نەفسی خۆیدا و جۆرێکە لە "جیهادی ناوەکی".

سەرەتا بۆ ئەوەی ببینە بەکارهێنەرێکی هوشیار پێویستە ئەمانە بزانین: ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر، تا لە شوێنی خۆیاندا و بە شێوازێکی گونجاو بەکاربهێنرێن سوودبەخشن، بەپێچەوانەوە زیانبەخش دەبن. ژیان تەنها بریتی نییە لە کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت. بۆ ئامانجێك هاتووینەتە دونیاوە. ئامانجیشمان هەیە لە کۆمەڵایەتیبوون و تێکەڵاویکردنی مرۆڤەکان. زۆر بەرپرسیارێتی و ئەرکمان لە ئەستۆدایە کە بوونە مرۆڤ داخوازیەتی. بە شێوەیەکی گشتی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر ڕێگرن لەبەردەم بەجێهێنانی ئەم ئەرکانەدا. پێویستە

بەو رێژمیەی کە خزمەت بە ئەرك و بەرپرسیارێتییەکانمان دەکەن، ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر بەکار بهێنین. لەگەڵ مرۆڤەکاندا پێکەوە بین و، لەنێو سروشتدا بین. هیچ شتێك شوێنی کتێبخوێندنەوە ناگرێتەوە. پێویستە هەموو رۆژێك گەر کەمیش بێت کتێب بخوێنینەوە. گرنگ ئەوەیە دەرکمان بەهێز بێت. بەهای ژیان و کات بزانین.

## چۆن لە شەقامدا چاوەکانم دەپارێزم

”ئەی عەلی، دوابەدوای یەك مەڕوانە! لە یەکەم ڕوانین دەبەخشرێیت، بەڵام لە دووەم ڕوانین نابەخشرێیت.“[1]

”حەیا دە بەشە. نۆی لە ئافرەتدا و، یەکی لە پیاودایە“ وەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە، ئافرەتان حەیایان لە پیاوان زیاترە. دیسان لە فەرموودەیەکی تردا ئازیزمان دەفەرموێت ”حەیا جوانە، بەڵام لە ئافرەتدا جوانترە.“ لەگەڵ ئەمەشدا نۆ لە دەی شەهوەتیش لە ئافرەتدایە. ئەوەی دەیوەستێنێت حەیای ئافرەتە.

ڕێنوێنییەکانی مامۆستا فەتحوڵڵا گولەن لەمەڕ ئەم بابەتە ئەمانەی لای خوارەوەن:

”لە هەر دەرچوونێکماندا بۆ بازاڕ و سەرشەقام، ئەگەر هەیە کۆمەڵێك حەرامان بەرچاو بکەوێت. گەر چاوانمان دابخەین، ئەو کات ناتوانین بە ڕێدا بڕۆین، گەر بیکەینەوە، ئەو کاتەش دیمەنە نەخوازراوەکان دونیای ڕۆحمان تووشی گێژاو دەکەن و، دەمانخەنە نێو گوناهەوە.“

---

١. الترمذي، الأدب ٢٨؛ أبو داود، النكاح ٤٢.

ئەو مرۆڤەی لەبەرامبەر حەرامدا چاوەکانی دادەخات، هیچ کاتێك تووشی لەدەستدانێکی ماددی یان مەعنەوی نابێت و، ئەو کەسەش کە ئەم هەستیارییە دەنوێنێت خراپەی بۆ کەس نابێت. مرۆڤێکی وەها کە بە شێوەیەکی سەرکەوتوو و دروست و دڵسۆز کار دەکات و خزمەتێکی ڕاستەقینە بە ئەنجام دەگەیەنێت، هیچ کاتێك نابێتە قوربانیی ژیانێکی شەیتانانە. لە لایەکی ترەوە کاتێك ئەو کەسەی ڕەگەزی بەرامبەر خۆی بۆ ئەم ڕوانینە برسییانە نمایش دەکات، هیچ شتێکی ماددی یان مەعنەوی لەمە دەست ناکەوێت. نەك دەستی ناکەوێت، بەڵکو نەخۆشخانە و، بەندیخانە و، مەمەڕەکانی دادگا و، ستوونی ڕۆژنامەکان گەورەترین شایەتن کە چ شتانێکی بە ناوی خۆی و، دوێنراوەکانی و کۆمەڵگا و، شارەکەیەوە لەدەستداوە. لە یادمان نەچێت، چاکترینی میوەکان ئەو کێڵگانەی سەر زەوی بەرهەمی دەهێنن کە لە تیشکە زیانبەخشەکان و پریشکەکان پارێزراون، لە بەرامبەر ئەمەدا چی لەو دڵە دەربەدەرانە چاوەڕێ دەکەیت کە بەبێ پاراستن گیرۆدەی ڕوانینە سوتێنەر و تیشکە کوشندەکان هاتوون و لە ئاکامدا کون کون بوون و ئیرادەیان ئیفلیج بووە!

نابێت لە هەموو بێتاقەتییەکماندا بچینە سەر شەقام. بەڵێ، ئایا مرۆڤ هەر کە بێتاقەت بوو دەبێت بچێتە سەر شەقام؟ چەند تێگەیشتنێکی نەنگە! درزێکی وەهایە کە شەیتان زۆر بەسانایی دەتوانێت دزەی لێوە بکات... ئەو مرۆڤەی کە هەست دەکات بێتاقەتییەکەی لە شەقامەکاندا دەڕەوێتەوە، وەك ئەوەیە لە باران هەڵبێت بۆ ناو تەرزە.

بێتاقەتی، لە ئائاسوودەیی دڵ و، پەیوەندینەبەستن لەگەڵ خوا و پێغەمبەر و، وابەستەنەبوون بە پەرستش و، بێهاوڕێیی و، بەتاڵبوون لەمەڕ خوێندنەوە و تێفکرین و، نەبوونی سەرقاڵیی و خزمەتنەکردنەوە سەرچاوە دەگرێت. مانای

وایە لەم کەسانەدا کون و دەرچەکان بۆ دزەکردن و هاتنەژوورەوەی شەیتان لە دۆخێکی تەواو ئامادەدان. کەسێك بە دەستی شەیتان مارانگاز بێت و دووبارە لەو شوێنانەدا بێت و بچێت کە تیرەکانی شەیتانی لێ دەبارێت، وەك ئەوە وایە سکی بە خواردنەوەی ئاوی دەریا ئێشابێت و دووبارە بۆ ڕەواندنەوەی تینوێتییەکەی پەنا بۆ دەریا بەرێتەوە.

بابەتەکە ئەم لایەنەشی هەیە: دەکرێت بێتاقەتی وەك گووشینی دڵ لە لایەن خوا و بە ناوی "القابض"ییەوە لێی بڕوانرێت. بۆیە ئەمە تاقیکردنەوەیەکە. لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی وەهادا ئاستی بەردەوامی و ڕاستگۆیی مرۆڤ ئاشکرا دەبێت. واتە خوای گەورە تاقیی دەکاتەوە لەسەر ئەوەی ئایا لە کاتی بێتاقەتی و دڵتەنگیشدا پەرستشەکانی ئەنجام دەدات. دەبێت ئەوەش باش بزانین کە، ئەو نوێژەی لەم حاڵەتەدا بەجێ دەهێنرێت، زۆر لەو نوێژە خێردارترە کە لە فەزای ئارەزوومەندانەی هاوڕێیان و، لە نێو کۆمەڵدا بە شەوق و تامەزرۆییەوە بەجێ دەهێنرێت، چونکە لەو ساتەدا مرۆڤ لەسەر هێڵی جەنگە. دواجار وەك چۆن خۆر لە پشت هەورەکانەوە خۆی مەڵاس دەدات، ئەم حاڵەتەش کاتییە، ئەم جارەیان خوای گەورە بە ناوی "الباسط" ی خۆیەوە دڵی فراوان دەکات و، شەوقی پێ دەبەخشێت. بە جۆرێك هێندەی ئەو ناڕەحەتی و سەختییە پاداشت و خێری بۆ دادەنێت.

کاتێك دەچینە بازاڕ، پێویستە ئاگامان لە چەند خاڵێك بێت:

وەك چۆن ئالودەی ماددەی بێهۆشکەر گەر حەبەکەی دەست نەکەوێت خەم دای دەگرێت، دوورکەوتنەوەی مرۆڤیش لەو گوناهانەی پێیان ڕاهاتووە دەبێتە مایەی ئەوەی تووشی ناڕەحەتی سەختی ڕۆحی ببێت و گەر فەزای گوناهی

بۆ بڕەخسێتەوە، یەکسەر تێی دەکەوێت. بۆیە چ بۆ کەسێکی گوناهکار و چ بۆ ئەوانەش کە بە وێنەی ڕاکردن لە مار و دووپشك لە گوناهـ هەڵدێن، چەند خاڵێك هەن کە پێویستە سەرنجیان بدەین:

١. گەر پێویست نەبوو، نەچینە بازاڕ، هەوڵ بدەین پێویستییەکان بە کۆ بەجێ بهێنین. گەر هیچ جۆرە کارێکمان نەبێت و فەرمانبەرییەکی خزمەتی ئیمان لە ئارادا نەبێت، پێویستە لەو شوێنانە دوور بکەوینەوە کە بەلێشاو گوناهیان لێ دەبارێت.

٢. لە بیرمان بێت کە مافی ڕێگاکە بدەین. هاوەڵانی بەڕێز و ئازیزمان، زۆر جار بۆ باسکردنی ڕاستی و حەق ڕوویان لە بازاڕ دەکرد. حەزرەتی ئەبوبەکر و، حەزرەتی عومەر و، حەزرەتی ئەبوزەریش (رضي الله عنه) ئەمەیان دەکرد. ئەوانەی بە ئامانجێکی وەهاوە دەچنە دەرەوە مافی شەقام و ڕێگاکە دەدەن و لە گوناهـ دەپارێزرێن. سەروەرمان (صلى الله عليه وسلم) ڕێگەی نەدەدا هاوەڵانی لە کەناری ڕێگا و شەقامەکاندا دابنیشن. کاتێك دەیانفەرموو "سوود لەو دانیشتنەماندا هەیە ئەی نێردراوی خوا!" ئازیزیشمان دەیفەرموو "کە وابێت، مافی ڕێگاکە بدەن." واتە "چاوتان لە ئاست حەرامدا دا بخەن، بەرد و دڕکی سەر ڕێگاکە لا ببەن، سڵاوی ڕێبوارەکان وەر بگرن، سڵاو بکەن و فەرمان بە چاکە و دوورەپەرێزی لە خراپە بکەن و باسی ڕاستی بکەن."[1]

ئیدی تا ئەم نیەتە پاکە بوونی هەبێت ڕەنگە خراپە و گوناهەکان سەراپا ببنە چاکە.

---

١. بخاري، الأستئذان ٢، المظالم ٢٢، اللباس ١١٤، السلام ٢،٣.

٣. بە شێوازێکی ئامادە بچینە دەرەوە. پێویستە چۆن مرۆڤ بە کێڵگەیەکی میندا دەڕوات، چۆن ئامادە و پڕچەك لەو شوێنانەدا دەسووڕێتەوە کە دوژمنە سەرسەختەکانی لێیە، بە هەمان شێوە بۆ بازاڕیش بە ئامادەیی و پڕچەکی بچێت. بەپێچەوانەوە گەر بەتەنیا خۆی و لەگەڵ هەستەکانیدا و بەبێ ئامادەکاریی و بێچەك و لە دۆخێکی بەتاڵدا و بەبێ ئەوەی قەڵغان و فیشەکە مەعنەوییەکانی ئامادەکردبێت بچێتە بەردەم تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان، ئەو کات خراپەکان و دیمەنەکانی گوناه و هەموو جۆرە هەوایەکی فانی دەوراندەوری ڕۆحی دەدەن. جا گەر ئەم دۆخە چەند جارێکیش دووبارە ببێتەوە، ئیدی وای لێ دێت هەستەکانی دەمرن و کەمتەرخەم بەرامبەر بە خراپەکان و نامۆ بە گوناهەکان، بە بازاڕدا دەگەڕێت، بێگومان ویستی شەیتانیش هەر ئەمەیە.

٤. پێش ئەوەی بچینە دەرەوە پێویستە بچینە دۆخی هەڵکشانەوە. دەبێت پێش ئەوەی بچین بۆ بازاڕ، شتانێك بخوێنینەوە، شتانێك تەماشا بکەین یاخود گوێ لێ بگرین دڵمان ببزوێنێت و، جۆشمان پێ ببەخشێت و، چاوانمان بهێنێتە فرمێسك و هەستەکانمان بهێنێتە جوڵە، پاشان بەو جۆرە بچینە دەرەوە. بەڵێ، پێویستە تەنها بە هەڵکشانێکی لەم جۆرەوە بچینە بازاڕ تا بتوانین بەربەستێك لەبەردەم گوناهەکاندا دابنێین.

٥. پێویستە لە دەرەوە لەگەڵ هاوڕێی باشدا بگەڕێین. کاتێك دەچینە دەرەوە، لەوێ چەندین دوژمن چاوەڕێمان دەکات، بۆیە پێویستە لەگەڵ چەند پارێزگارێك (هاوڕێ)دا بچینە دەرەوە. زۆر پێویستە کاتێك دەچینە بازاڕ یەك دوو هاوڕێی وەهامان لەگەڵدا بێت کە دونیای ڕۆحمان بەپێوە ڕاگیر بکەن. چاودێریی ناوەکیی مرۆڤ ڕەنگە زۆر جار بەس نەبێت بۆ ڕاگرتن

و پاراستنی خۆی. بۆ ئەوەی هەموو کات هەست بە چاودێری خوای پەروەردگار بکەین، دەبێت ئیمانمان بە مانایەکی تەواو گەش و پاراو بێت. ئەمەش ڕەنگە هەموو کات بەو جۆرە نەبێت.

بەڵێ، ڕەنگە هەندێك ساتی وەهامان هەبێت کە نەتوانین بەسەر خۆماندا زاڵ ببین و، چاومان بچێتە سەر حەرام و، بەم شێوەیەش برینێك لە ڕۆحماندا دروست ببێت، بیرە خراپەکان وەك تۆو لە مێشکماندا بوەشێنرێت و گوناهەکان لە ڕۆحماندا بترشێنرێت. بەڵام گەر چەند هاوڕێیەکمان لەگەڵدا بێت، دەتوانین باس لە شتانی جوان بکەین. دەشتوانین بە چاوی هاوڕێیانمان کۆنترۆڵی خۆمان بکەین و ئاگامان لە ڕوانین و گوێچکەکانمان بێت. ڕەنگە هەندێك جار لەو کاتەدا لە یادمان بچێت کە خوای گەورە ئاگای لێمانە، بەڵام لەبەرامبەر هاوڕێیانماندا بۆ ئەوەی تووشی عەیبە نەبین هەست بە پێویستیی ڕێکوپێکبوونمان دەکەین. ڕەنگە ببێتە ڕیا، ببێتە سونعی بوون، بەڵام با ببێت، لەبەر ئەوەی ئەمە باشترە لە خراپە و تووشبوونمان بە گوناه. گەر ڕیا لە کردەوە ئەرێنییەکاندا "بۆ نموونە لە نوێژدا" ڕۆحی کردەوەکە تێکیش بدات، لەمەڕ کردەوە نەرێنییەکان زیانێکی وەهای نییە. بۆ نموونە گەر مرۆڤ تەنها بۆ ڕیا زینا نەکات، زینای نەکردووە، بۆ ئەوەی نەیبینن دزی نەکات، دواجار دزی نەکردووە. زینای چاو، زینای گوێچکە، زینای دەست و قاچ، زینای بیر، بەڵێ، هەرچییەك بێت و هەر شتێك کە فسق و گوناه بهێنێتە نێو خەیاڵی مرۆڤەوە، هەر بیرێکی خراپ، گەر بۆ دەرکەوتنیش بێت وازی لێ بهێنرێت و، ئەو گوناهە دەست و پەنجەکانی لە ڕۆحمان وەرنەدات، ئەوا لە سەلامەتیداین.

بەڵێ، بە گوێگرتن لە قسە یاخود ئامۆژگارییەکی جوان، بە خوێندنەوەی نووسینێکی جوان، بە تەماشاکردنی شتێکی جوان یاخود بە موتالاکردنی

دیمەنێكی جوان بە ڕووی مەعریفەت و سام و حورمەتدا بەخەبەر بێین و بەم شێوەیە و بەپڕی لە ماڵ دەربچین و، لەژێر هەڵمی ئەم كاریگەرییانەدا بۆ سەر كارەكانمان و قوتابخانەكانمان و، ئەركەكەمان و خزمەتەكەمان بچین و بەردەوام كاریگەریی ئەمانە لە ڕۆحماندا هەست پێ بكەین، بەم شێوەیە لە شەیتان و لە گوناهەكان پارێزراو دەبین.

٦. پێویستە خۆمان لەو شتانە خاوێن بكەینەوە كە لە دەرەوەی ئیرادەوە دێن و بەرمان دەكەون. سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەمان، ڕەنگە لە ڕاست و چەپمانەوە، بەدەر لە ئیرادەمان لەكە و قوڕ بەر دڵ و ڕۆحمان بكەوێت. لەم جۆرە دۆخانەشدا پێویست دەكات دەستبەجێ بچینە ژێر سایەی پەرستشەكانەوە و ڕوومان بۆ لای پەروەردگارمان وەربچەرخێنین. ڕۆژێكیان یەكێك لە هاوەڵان وەك ئەوەی مێشكیان پێكابێت، دێتە خزمەت پێغەمبەری ئازیزمان و خۆی دەدات بە زەویدا و دەناڵێنێت "تیاچووم ئەی نێردراوی خوا، ئافرەتێك لە شەقامەكەوە ڕەت دەبوو تەماشام كرد و دەستم لێدا." لەو كاتەدا ئایەتێك هاتە خوارەوە:

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ (هود: ١١٤)

نوێژیش بەچاكی ئەنجام بدە لە هەردوو سەری ڕۆژەوە (كە نیوەڕۆ و عەسرە) و لە سێ كاتەكەی شەویشدا كە (مەغریب و عیشا و بەیانی) یە، نزیكن لە ئەمسەر و ئەوسەری ڕۆژەوە. بەڕاستی كردەوە چاكەكان كردارە خراپەكان لا دەبات و گوناهەكان دەشۆنەوە. ئەوە ئامۆژگاری و بیرخەرەوەیە بۆ ئەوانەی یادی خوا دەكەن.

بەڵێ، نوێژەكان لای خوا گوناهەكان دەسڕنەوە و گسكیان لێ دەدەن. لە

فەرمووودەیەکدا ئاماژە بەوە دراوە کە نوێژەکان دەبنە کەفارەتی ئەو گوناهە بچوکانەی کە لە نێوان نوێژەکاندا ئەنجام دەدرێن.[1] ئەو بەندایەتی و، نوێژ و، پەرستشانەی کە بۆ پەروەردگاری ئازیزمان ئەنجامدراوە -پشت بە خوا- دەبنە کەفارەت بۆ ئەو گوناهانەی بەبێ ئەوەی لە دەستی خۆماندا بێت و بە تێپەڕاندنی ئیرادەمان خۆیان پێدا کێشاوین. لەگەڵ ئەوەشدا هەر چاوداخستنێك لەبەرامبەر حەرامدا خێری ئەنجامدانی واجبێك دەست مرۆڤ دەخات.

٧. پێویستە گوناهەکان بە تەوبە و ئیستیغفار خاوێن بکرێنەوە. لە هەموو گوناهێکدا ڕێگایەك هەیە بەرەو کوفر. گوناه پێش هەموو شتێك مانای دەرچوونی مرۆڤە لە فەزای ڕەزامەندیی پەروەردگار و بریتییە لە ڕەتکردنەوەی پارێزگاریی ئیلاهی. بە هەمان شێوە مرۆڤ بە ئەنجامدانی گوناه دەبێتە نێچیری ڕاستەوخۆی شەیتان، تا گوناهەکان زیاد بکەن پارێزگاری خوای گەورەش کەم دەکات.

گوناه ژەنگ و لەکە و پیسییە، وەك دەربڕینی فەرمووده پیرۆزەکە، گەر لەکە لەسەریەککەڵەکەبووەکان، دەستبەجێ بە تەوبە و ئیستیغفار خاوێن نەکرێنەوە، دەچنە نێوانی ژیانی دڵمان و گۆشەنیگای پەروەردگارەوە بۆ ئێمە، بەم جۆرە ئەو درەوشانەوانە دەبڕن کە لەوەوە بۆمان دێن و، شەماڵەکانی ڕەحمەت دادەپۆشن و، لە عینایەتی خوای گەورە بێبەشمان دەکەن.[2] ئەو دڵەش کە بەبێ پارێزگاری ماوەتەوە، لە ئەنجامدا -خوا پەنامان بدات! بارێکی وەها وەردەگرێت کە شەیتان بتوانێت کوفری ئاڕاستە بکات.

خاڵی دووەم؛ ئەو مرۆڤەی گوناهێکی ئابڕووبەر ئەنجام دەدات، نایەوێت

١. مسلم، الطهارة ١٦،١٥،١٤؛ الترمذي، المواقت ٤٦؛ ابن ماجه، الطهارة ٧٩، ١٠٦؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢/٤٠٠.

٢. الترمذي، التفسير (٨٣) ١؛ إبن ماجة، الزهد ٢٩.

کەس بە گوناهەکەی بزانێت و بیبینێت. بەڵام دەشزانێت کە خوای گەورە و فریشتەکانی دەزانن کە ئەوەی ئەنجامداوە. شەیتان کە هەردەم چاودێریی ئەم بارە لاوازەی دەکات، لەم کاتەدا وای لێ دەکات بڵێت "خۆزگە کەس ئەم گوناهەمی نەبینیبا، یان خۆزگە ئەم شتە گوناه نەبووایە!"

پێداگری لە گوناهدا و بە بچوك تەماشاکردنی، مرۆڤ بەرەو کوفر کێش دەکات. گەر مرۆڤ بە گوناه ڕاهاتبێت و، نەتوانێت لێی جودا ببێتەوە، هەندێك جار ڕەنگە بڵێین با ئەم کەسانە لەو دۆخە ڕزگار بکەین بەڵام بە زیان بشکێتەوە و بیانخەینە دۆخی خراپترەوە. بۆ نمونە ڕەنگە بە کەسێك بڵێین "مەی مەخۆرەوە" ئەویش لەبەرامبەردا بڵێت "پێکێك حەرام نابێت، ئەوەندەشم بە ئەستەم دەستکەوتووە." بەم جۆرە و بە قسەی کوفرئامێز خۆی دەکاتە قوربانی ئەو گوناهە. بە هەمان شێوە گەر نوێژ نەکات و بڵێین "وەرە، نوێژ بکە!" ئەویش لەبەرامبەر پێداگریماندا دەست دەکات بە هێنانەوەی بەهانە بۆ نەکردنی و دواجاریش دەڵێت "نایەم."

گوناه لە بنەڕەتدا گەر پێداگریی لەسەر کرا و وەك بێزیان تەماشاکرا و، بە تەوبە و ئیستیغفار خاوێن نەکرایەوە، دەبێتە گوناه. بەپێچەوانەوە ئەگەر پێداگری لەسەر ئەنجامدانی نەکرێت و، زیانەکەی بزانرێت و سامی لێ بکرێت و، بە تەوبە و ئیستیغفار و پەشیمانییەکی دڵسۆزانەوە وازی لێ بهێنرێت، بە گوزارشتی قورئانی پیرۆز پشت بە خوا بەر لێخۆشبوون دەکەوێت. گەر هێندەی چیاکانیش بێت، بێجگە لە شیرك هیچ گوناهێك نییە خوای گەورە لێی خۆش نەبێت. هەر ئەوەندەی پەنا ببرێتە بەر دەرگای لێخۆشبوون و میهرەبانی و لێبووردەیی ئەو.[1]

[1]. لە سێبەری باوەڕدا - ۲، بابەتە ناسۆییەکان، ۱۲۱-۱۲۲.

بۆ ئەوەی بەهۆی نەزەری حەرامەوە دووچاری جەنجاڵیی زیهنی و لاوازی توانستی مێشك نەبین، پێویستە گەر هیچ کارێك یاخود فرمانێکی پەیوەندیدار بە خزمەتی ئیمانەوە لە ئارادا نەبێت، دوور بکەوینەوە لە چوونە نێو بازاڕ کە بەلێشاو گوناهی لێ دەبارێت. مرۆڤ گەر هەر ویستی بچێتە دەرەوە، ئەو کاتەش وەك چۆن لە کێڵگەی مینەوە ڕەت دەبێت، پێویستە بە ئاگادارییەکی زۆرەوە ڕێگا بگرێتە بەر و لە بەرامبەر هێرشە شەیتانییەکاندا لە ئامادەباشیدا بێت. سەرکەوتنیش لەمەدا دوو مەرجی هەیە، یەکەمیان، پێش ئەوەی بچێتە بازاڕ شتانێکی دڵبزوێن و چاوگرێن و جوڵێنەری هەستە مەعنەوییەکان بخوێنێتەوە یان گوێ لێ بگرێت، دووەمیشیان، کاتێك بۆ شوێنێك دەڕوات، تا پێی بکرێت هەوڵ بدات بەتەنها نەبێت و یەك دوو هاوڕێی دڵهوشیار بکاتە هاوەڵی خۆی. سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەش هێشتا ڕەنگە لە دەرەوەی چوارچێوەی ئیرادەی مرۆڤەوە چەندین لەکە و قوڕ و چڵپاو لە ڕاست و چەپەوە بێن و دڵ و ڕۆحی پیس بکەن. لەم جۆرە بارودۆخانەشدا، پێویستە لە یەکەم دەرفەتدا هانا بۆ بەرماڵەکەمان ببەین و ڕوو بکەینە جەنابی حەق. پەرستشەکانی وەك نوێژ و، بەخشین و، ڕۆژوو و، دوعا -پشت بە خوا- دەبنە کەفارەت بۆ ئەو گوناهانەی کە نائیرادین و خۆیانمان پێدا دەکێشن.

لەڕاستیدا نەزەری حەرام لەکەیەکە کە دەکرێت ڕێگای لێ بگیرێت و مەترسییەکە کە دەکرێت بە بەکارهێنانی ئیرادە دوورەپەرێزیی لێ بکرێت. گەر مرۆڤ کەمێك هەوڵ بدات، دەتوانێت ئارام بگرێت و تەماشای دیمەنە گوناهـ ئامێزەکان نەکات. پاراستنی چاوەکان لە دیمەنی نابەجێ، ئەرکێکی هێندە سەخت نییە بتوانێت چۆك بە ئیرادەمان دابدات، لە یەکەم ساتدا کە نەزەرێك دێت و تیرەکەیمان بۆ دەوەشێنێت، ئیرادەمان هێزی بەسەر داخستنی

چاوەکاندا دەشکێت. جا گەر مرۆڤ بیر لەوەش بکاتەوە کە هەر داخستنێکی چاوەکان لە ڕووی حەرامدا وەك بەجێهێنانی واجبێك پاداشتی دەست دەخات، لەو یەکەم ساتەدا دەتوانێت خۆی لە گوناهەکە بپارێزێت. بەپێچەوانەشەوە گەر دەستبەجێ چاوی لە حەرام وەر نەچەرخێنێت و خۆی بداتە ئەو کارە و دووبارە و دووبارە تەماشا بکاتەوە، ئیدی ئەگەری پاشەکشێکردنی کەم دەبێتەوە. بە وێناکردنی ئەو دیمەنانەی کە لە چاوەکانییەوە دەڕژێنە نێو مێشکییەوە، دەیانهێنێتەوە بەرچاوی و گەر گەورەی بکات بەتەواوی لە کەنارەکە دوور دەکەوێتەوە. لەپاش ئەوەدا گەڕانەوە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر زیاتری پێویست دەبێت. وەك شاعیر دەڵێت "خۆم داوەتە دەم دەریای یاخیبوون، نامباتەوە سەر کەناری ئارامی" خوا بمانپارێزێت ئەو کەسەی بەو ئەندازەیە لە کەنار دوورکەوتووەتەوە دەریای گوناه هێندەی دێنێت و دەبات، ڕێگەی نادات جارێکی تر بگاتەوە بە کەنار.[1]

## پەیوەندیی نێوان ئەنجامدانی گوناه و ئیرادەی مرۆڤ

مامۆستا فەتحوڵڵا گولەن لە وەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بە شێوازی ئەو پەیوەندییەی کە لەنێوان ئەنجامدانی گوناه و ئیرادەی مرۆڤدا هەیە و، چۆنێتی ئەو هەڵوێستەی کە پێویستە لە بەرامبەر گوناهەکاندا بنوێنرێت، بەم شێوازە وەڵام دەداتەوە:

"گوناهەکان و ئەو بانگهێشتکارانەی کە مرۆڤ بانگهێشتی گوناه دەکەن، وەك دێوەزمەی نێو ئەفسانەکان وەهان. گردێك، دوو گرد، سێ گرد.

---

١. م. فەتحوڵڵا گولەن، گۆزەی شکاو -٦، ئیکسیری ئەمری ١٢٨-١٢٩

کەس نازانێت لە کوێدا لە سیمای پەرییەکدا دێنە بەردەمتان یاخود دەبنە عفریتێك و پەرێشانتان دەکەن.“

گوناهانێك هەن بە هەمان شێوەی ماددە هۆشبەرەکانن. دەستلێدانێکیان زەحمەتە. مرۆڤ یەك جار پێیان ڕاهات ئیدی زۆر سەختە بتوانێت یەخەی خۆییان لێ ڕزگار بکات. پاش ئەوەی یەك جار دەستی پێ کرد ئیدی بۆ وازلێهێنانی دە هێندەی بەرگریی یەکەم جار پێویستیی بە هێزی ئیرادەیە. کاتێك دێینە سەر ئەوانی تر، ئەوان بابەتی کورتخایەن و ساتین. بەڵام ئەوانیش دەتوانن مرۆڤ بخنکێنن. چەندین بڕیار هەبوون کە لەنێو حاڵەتێکی ڕۆحی یەك ساتدا دراون و سەرەنجام بە مردنی مەعنەویی مرۆڤ کۆتایی دێن. لەنێو ئەو حاڵەتە ڕۆحییەدا بڕیار دەدەن، بەڵام کۆتاییتان دێت.

لە ڕوونکردنەوەی ئایەتی پیرۆزی ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾[1] پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموورێت ”کاتێك مرۆڤ گوناهێك ئەنجام دەدات، خاڵێکی ڕەش لە دڵیدا دروست دەبێت. گەر تەوبە بکات و پەشیمان ببێتەوە و، داوای لێخۆشبوون بکات، دڵی دیسان دەگەشێتەوە. بەڵام گەر دیسان بچێتەوە سەر گوناهەکە، ئەو پەڵەیە گەورە دەبێت و، دواجار دەست بەسەر هەموو دڵیدا دەگرێت.“ ئەو ژەنگەی خوای گەورە لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئاماژەی پێ دەدات ئەمەیە.

بەڵێ، لەکەیەك یاخود ژەنگێکی وەها کە لە ژیانی مەعنەویماندا دێتە کایەوە، ڕێگر دەبێت لەوەی درەوشانەوەکانی خوای گەورە بەتەواوی ئاڕاستەی ماهییەتمان ببن و، لەوێدا خاڵێکی کوێر دروست دەکەن. هەر گوناهە و

---

[1] سورەتی المطففین: ١٤.

بانگی گوناهی تر دەکات. یەك هەڵە، بانگهێشتنامەی هەڵەی دووەمە. یەك جار کەوتن، دەکرێت وەك سەرەتایەك بۆ کەوتنێکی دووەمی جددی هەژمار بکرێت. کاتێك یەك جار دەکەون، گەر بتوانن هەستنەوە و خۆتان کۆ بکەنەوە، بە بیرکردنەوە لەوەی لەو شوێنەدا کەوتوون و ڕەنگە دووبارە تیایدا بکەونەوە، پێویست دەکات لەویَ دوور بکەونەوە. بەڵام گەر بەردەوام بن لە ڕۆیشتن، کەمێکیش بە ئەندێشەی لەرزینەوە دووبارە خلیسکان و کەوتنتان چاوەڕوانکراو دەبێت.

لەڕاستیدا زۆر گرنگە مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە نەچێتە نێو فەزایەکی وەهاوە و، بەردەوام بەوریاییەوە بژی و، لە ئاگاداری و وریاییدا پەیڕەوی ئەو ئاسۆیە بکات کە لەنێو تەسەوفدا هەیە، واتە، بەردەوام هەست بە هەڵچوون و جۆشی هەستەکانی تایبەت بەو بکات و، لە ژینگەیەکدا بێت کە بەردەوام مرۆڤ بۆ حزووری ئەو ڕا بکێشێت. مرۆڤ گەر وەلیش بێت، نابێت هەرگیز متمانە بە نەفسی بکات. پێویستە هاوڕێیەکی باش هەڵبژێرێت. هاوڕێیەکی وەها بەردەوام چاوانی لەسەری بێت، گەر هاوڕێکەی بەردەوام چاوی لەسەری بێت، ئیدی تووشی چاوی بەد نابێت. دەبێت چاوی ئەمیش لەسەر ئەویان بێت. دەتوانین پشکنینی ناو بنێین، واتە، ئاگابوون لە یەکتر، پشتگیریریکردنی چاوانی دوو دۆست لە یەکتر. لە پەیوەندییەکی وەهادا چاوێکی سێهەم ناتوانێت بێتە نێوان دوو چاوەکەوە و خۆیان پێدا بدات. پشت بە خوا. بەم شێوەیە ئەو دوو هاوڕێیە لە چاوی بەد بەدوور دەبن.

شتانی وەك ڕیازەت کە سۆفییەکان وەك "مصالح المرسلة" گوزارشتیان لێ دەکەن، دەچنە چوارچێوەی ئەم بیرۆکەیەوە. ئەویش تەجرید و ماوەیەکی

دیاریکراو و ڕاهێنان و مەشقێکی تێدایە. مرۆڤ بۆ ماوەی چل ڕۆژ لە فەزای مەترسیدار دوور دەکەوێتەوە و، خۆی لەگەڵ هەوایەکی نوێدا ڕادەهێنێت. ئیدی گەر ڕێبوارەکە نەتوانێت لە چل ڕۆژی یەکەمدا هاندانی تەواو وەر بگرێت و، ئەو کەشە نەکاتە بەشێك لە سروشتی خۆی، دیسان چل ڕۆژی تر تاقی دەکاتەوە. هەر نەبوو چل ڕۆژی تر... لە ئەنجامدا مرۆڤ لەگەڵ کەمخواردن و، کەمخواردنەوە و، کەمقسەکردن و، کەمخەوتن و، کەمێك ژیانی خەڵوەتیشدا ڕا دێت.

ئەو کەسەی ئەمە ناکات، پێویستە بە ڕێگایەکی تر خۆی سەرقاڵ بکات، بچێتە نێو فەزایەکی ترەوە کە ببێتە مایەی ڕەزامەندیی خوای گەورە. بۆ هەر کوێ بچێت، هەستێت بە ئەنجامدانی هەر کارێك، پێویستە هەردەم لە بیری ئەوەدا بێت ڕاستی بۆ کەسانێك ڕوون بکاتەوە و لەو خاڵەدا قووڵیان بکاتەوە. پێویستە کاتێك هەر کەسێك دەبینێت بڵێت "هەرچۆنێك بێت دەبێت شتێك بگەیەنم بە ڕۆحی ئەم مرۆڤە، دەبێت ئایینەکەمی پێ بناسێنم، پێویستە ڕێگاکانی دوورکەوتنەوە لە تاریکی بۆ ئەمیش باس بکەم." پێویستە مرۆڤ نەخۆشی ئەمە بێت. ئیدی گەر بەم شێوەیە هەردەم بیر لەمانە بکاتەوە، بەبێ ئەوەی پێویستی بە ڕیازەتێکی وەها ببێت، دەتوانێت لەبەردەم پەروەردگاردا (جَلَّ جَلَالُهُ) چۆك دابدات و لەمەڕ بەندایەتیی خۆشی سەربەرز ڕابوەستێت، بە پشت و یارمەتی خوای گەورە.

نابێت بەسادەیی بڵێین هەڵەیە، لەبیرچوونە یان گوناهێکە و ئیدی تێپەڕین، ئەمانە دەتوانن بە تێپەڕینی کات مرۆڤبوونی مرۆڤ دابخورێنن. هەڵە، لەبیرچوون یاخود گوناه گەر بە ئەگەرێکی سەدا یەکیشەوە بێت وەك

دێوەزمەیەك مرۆڤ پەلکێشی خاڵی مردن بکات و بیخاتە مەترسییەوە، دەبێت مرۆڤ زۆر لە ئەگەرێکی وەها بترسێت و سڵی لێ بکاتەوە. بۆ نمونە، گەر بە ئێوە بڵێن ''وەرە نەشتەرگەریی دڵ بکە، سنگت شەقار دەکەن، بەڵام لە ئەنجامدا بەئاسانی هەناسە دەدەیت و ژیانێکی ئاسانتر بەسەر دەبەیت.'' بەڵام لەگەڵ ئەم داواکارییەدا گەر بە ئەگەری سەدا یەکیش بێت ئەوەت پێ بڵێن کە ڕەنگە نەتوانیت لەسەر مێزی نەشتەرگەری هەستیتەوە و مەترسی مردنیش لە ئارادا دەبێت، ئایا گرنگی پێ دەدەیت یان نا؟ لە ئێستادا پزیشکەکانی دڵ بۆ دڵدانەوەی ئەوانەی نەخۆشییەکەیان سەختە، بەپێی ڕێژەی هەزاری گوزارشت لە ئەگەری مردنەکان دەکەن لەبری ڕێژەی سەدی. جاران تەنانەت لە شەبەکە و باڵۆنێکیشدا بە ڕێژەیەکی سەدی ئەگەری مردن هەبوو، کەچی ئاماژە بەوە دەکەن کە ئێستا ئەو ئەگەرە لە هەزارەکاندا ماوەتەوە. بەڵام لەبەر ئەگەرێکی وەها، پزیشك هێشتا لەوە دەترسێت لە مێزەکە هەڵنەسنەوە و لەسەر ڕازیبوون بە مەترسیی مەرگ واژووتان پێ دەکات. دەڵێن ''من مەترسیی کۆتایی ئەم بابەتە لە ئەستۆ دەگرم'' و پاشان واژوو دەکەن. پزیشکەکە هێندە دەترسێت، ئێوەش بە ترس و لەرزەوە دەچنە ژووری نەشتەرگەری. گەر بەسەلامەتی لە نەشتەرگەرییەکە دەربچن، هەموو کەس خۆشحاڵ دەبێت و کەفارەتیتان لێ دەکات. چونکە ئێوە ئەگەرێکی مردنتان تێپەڕاندووە.

دەبێت بۆچی مرۆڤ لەبەرامبەر تەڵە شەیتانی و نەفسانییەکاندا کە دەبنە هۆکاری مردنی ژیانی مەعنەوی هەمان هەستیاری نانوێنێت؟ ماوەتەوە بڵێین، مەترسیی کەوتنە نێو داوی دێوەزمەکان لە ژیانی مەعنەویدا بە ڕێژەی سەدی و هەزاری ناپێورێت، بەڵکو بە ئەگەری زۆر گەورە گوزارشتی لێ دەکرێت. هەندێك جار ڕەنگە مرۆڤ بچێتە سەر ڕێگایەك کە ئەگەری

تەنانەت لە دەدا یەکی هەبێت خۆی بۆ ئەوەی بخاتە نێو هەلاکەت و فەلاکەتەوە. بۆ نمونە، تەنیایی هەنگاوێکی زۆر هەڵەیە کە بەم ئاڕاستەیەدا نراوە. پێکەوەمانەوەی دوو کەسیش هێشتا هەر هەنگاوێکی هەڵەیە. چونکە ڕێککەوتنی دوو کەس لەسەر خراپە ئەگەرێکی بەهێزە.

هەندێك جار گۆڕینی تەلەفزیۆنەکە لە ڕوانگەی ئەو دیمەنە ناشرینەوە کە دێتە پێش چاوتان، هەنگاوێکی هەڵەیە کە بەم ئاڕاستەیەدا نراوە. تەنانەت ئەگەری مەترسی ئەم دۆخانە بۆ سەر ژیانی مەعنەوی تا ڕێژەی (سەدا یەك) سەر دەکەوێت، لە یەکێك لە دوو دیمەنەکەدا خەنجەرێك لە ڕۆح دەدرێت. لەم ڕوانگەیەوە و بە لەبەرچاوگرتنی ئەنجامی ئەم کارە، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی سەرەنجامێکی دژوار نەبینەوە، پێویستە زۆر وریا بین. گەر فەرز یان ئەدای واجبێك لە ئارادا نەبێت، باشترە نەچینە بازاڕ، بەبەتاڵی نەگەڕێین، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ڕووداوێك نەبینەوە دڵ و ڕۆحمان بریندار بکات، پێویستە ئاگامان لە چاو و، گوێ و، هەنگاوەکانمان بێت. بۆ نمونە، ئەگەری لە سەدا چەند هەیە مرۆڤ لە لاپەڕەیەکی ئینتەرنێتدا دیمەنێکی نەشیاوی بەرچاو بکەوێت؟ ئەگەر ئەو مەترسییە بە ڕێژەی سەدی هەژمار بکەن، پێم وایە لە زەمینێکی زۆر مەترسیداردایین. مامەڵەکردن بەگوێرەی ئەم مەترسییە، هاوسەنگی و ئاگادارییە.

گەر فەرز یان واجبێك لە ئارادا نەبێت، بۆچی بچمە شوێنێك کە دڵم تێك بدات، بۆچی لەو دیمەنانە بڕوانم کە دڵم بریندار دەکات، بۆچی ڕۆحم لە زبڵ و خاشاك پڕ بکەم؟ بۆ ئەوەی بچمە نێو ئەم مەترسییانەوە، دەبێت لە ڕوانگەی فەرمانە تەکوینی و تەشریعییەکانەوە ئەرکێك لە ئارادا بێت.

بۆ نمونە، جەڵدە لێی داون و بە ئامبولانس بردوویانن بۆ نەخۆشخانە. ئەمە لە ڕوانگەی تەكوینییەوە ئەركێكە. لە لایەكی ترەوە، وەعز و ئامۆژگاری دەكەن، ئەركی تەبلیغ و نواندنتان بەجێ دەهێنن، لەو كاتەشدا دەبێت بۆ ئەو شوێنە بڕۆن كە پێویستە. چونكە ئەمەش ئەركێكی تەشریعییە. ئەوەندەی هەیە، كە سواری ئۆتۆمبێل بوون و، لە بازاڕەوە تێپەڕین... ئاگاتان لە هەر هەنگاوێكتان بێت و هەتا پێتان بكرێت خۆتان لە خراپە بەدوور بگرن. بەڵام ئەو قوڕ و پیسییانەی لەم ڕێیەدا بەرتان دەكەوێت لەو نارەحەتییانە هەژمار دەكرێن كە خۆلێپاراستنیان سەختە و "بەڵای گشتی"ن و چاوپۆشییان لێ دەكرێت. بەپێچەوانەوە لەولا لێپرسینەوە لەسەر هەر هەنگاو و هەر هەست و هەر ڕوانینێك دەكرێت. تەنها لەولا؟ نەخێر، لەملاش ئەو عینایەتەی كە زوو زوو بۆ نوقومنەبوونتان دێتە ڕێتان، دەبڕێت و ئیدی عینایەتی ئیلاهی نامێنێت دەبنە پەنابەرێك كە تەماشای ناكرێت و دەستی ناگیرێت. خوای بەخشندە و میهرەبان هەموو لایەكمان لە عاقیبەتێكی وەها بپارێزێت.

چونكە هەرچۆنێك بێت لە شوێنێكدا كە دەكەون و لەساتێكدا كە بەردەبنەوە زۆر كات بە دەستگیرۆیی و چاودێری و هاوكارییەك ڕزگارتان دەبێت. بۆ نمونە دەچن بەدەم گوناهێكەوە كە جڵەوی نەفستانی كردووە، لە شوێنێكەوە كە هیچ چاوەڕێتان نەكردووە، دۆستێكتان دێتە بەردەمتان. دەڵێت "وەرە با چایەك بخۆینەوە." لە كاتی چاخواردنەوەیەكدا، ئیلهامەكانی ڕۆحی لە سینەتاندا بەتاڵ دەكاتەوە. خوا وای لێ دەكات بیڵێت و، ئەویش چارەی دڵی ئێوە دەڵێت. كاتێكیش لەو جیا دەبنەوە تەماشا دەكەن عەزمێك لە ناختاندا نەماوە بەرامبەر بە گوناه، ویستی دەستخستنی خێر و پاداشت لە ناختاندا دروستبووە.

بەڵام دەبێت ئێوە بۆ عینایەت و چاودێرییەکی وەها لەو زەمینەدا بمێننەوە کە تایبەتە بە ئێوە و، سنوور نەبەزێنن. لە هەرێمی گومانلێکراو نزیك نەبنەوە و، بە چەندەها کیلۆمەتر لێوەی دوور بن. هەوڵ بدەن لە نێو ئەو سنوورانەدا بمێننەوە کە تایبەتن بە ئێوە، کاتێك بەبێ ویستی خۆتان دەچنە لایەکەی تر، ئەو پارێزگاری و عینایەتە بە شێوازێك دێتە بەردەمتان کە هەرگیز چاوەڕێتان نەکردووە هەروەك چۆن کاتێك ئەو منداڵەی هێشتا پێی نەگرتووە خەریکە دەکەوێت و دایك و باوکی لە پشتەوە دەست دەدەنە هەردوو شانی و ڕزگاری دەکەن، بە هەمان شێوە ڕزگارتان دەکات. دەبینن کە تاوەکو نێو مۆختان هەست بەم پارێزگارییە دەکەن. بەڵام ئێوە پێویستە سەرەتا پابەندی سنوورەکانی پادشا بن.

بەڵێ، بەندایەتی لە موو باریکتر و لە شمشێریش تیژترە. کەسانێك هەن گەیشتوونەتە سەرەوەی و خانووشیان تیادا کردووە، زۆرێکیش نەیانتوانیوە لەسەری ڕابوەستن و گرمۆڵە بوون و دواتر بەهیلاکچوون.

باس لە فیراسەتێکی وەهای حەزرەتی عوسمان (رضيَ اللهُ عَنْهُ) دەکەن. باس دەکەن کە یەکێك لە هاوەڵان لە شەقامێکی ڕێگەی مزگەوتدا چاوی بەر حەرام کەوتووە و حەزرەتی عوسمانیش بە شێوازێکی گونجاو ئاگاداری کردووەتەوە. مەگەر ئیماندار بە نووری خوای گەورە و بەسیرەت و فیراسەتەوە تەماشای چواردەوری ناکات؟ لەنێوتاندا هی واتان هەیە، سێسەد واتا لە چاوتاندا دەخوێنێتەوە. بەڵام ئەوانی تر لەبەر ئەوەی بینینی خۆیان سنووردارە، ناتوانن واتایەك بدەنە ئەو خوێندنەوەیەی ئەوان، ئەویش بۆ نەدرکاندنی نهێنیی خوای پەروەردگار خۆی دەشارێتەوە. چاوانی کراوە بە ڕووی مەلەکوتی

شتەکاندا کێ دەزانێت چەند شتی تر لە چاو و، دەم و، گوێچکە و، لوت و، ڕۆیشتن و، وەستانی مرۆڤدا دەخوێنێتەوە!

ئاه بەس بینرابا هەڵە و لەبیرچوون و گوناهەکان چ برینگەلێك لە دڵی مرۆڤدا دروست دەکەن! ئاه بەس زانرابا، ئەم دێوەزمانە چ کۆمەڵکوژییەك لە ئاسۆی دڵ و ڕۆحدا ئەنجام دەدەن![1]

## سەختیی تاقیکردنەوەکە و مژدەکانی تایبەت بەم سەردەمە

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ (النور: ١٩)

"بەڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن زینا و تاوان لەناو ئەوانەدا باوەڕیان هێناوە بڵاو بێتەوە، سزای پڕ ئێش و ئازار لە دونیا و دوارۆژ بۆیان ئامادەیە و خوا خۆی چاك دەزانێت (سەرەنجامی زینا و شەڕوالپیسی بەرەو کوێ دەچێت) ئێوە نایزانن."

لە ململانێی نەبڕاوەی نێوان شەیتان و مرۆڤدا ئاشکرایە کە شەیتان زۆر بەرِوونی بەتاڵییەکانی مرۆڤ دەزانێت. وەك لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە دەبێت شەیتان لە بەهەشتدا سەرنجی بنیاتنانی حەزرەتی ئادەمی دابێت و تێبینیی بۆشایی و لاوازییەکانی کردبێت، بۆیە لە پیلانی فیتنەکەیدا کە بووە هۆی لە بەهەشت دەرچوونی حەزرەتی ئادەم، پەنای بۆ بەکارهێنانی حەزرەتی حەوا برد.

ئادەم لەوەتەی هاتووەتە سەر زەوی کە مەیدانی تاقیکردنەوەیە، بە درێژایی مێژوو دیمەنی ئافرەت خراوەتە بەر چاوی، هەر لە دیواری ئەشکەوتەکانەوە

---

١.. م. فەتحوڵڵا گولەن، گوزەی شکاو ١.

تا دەگاتە سەقفی کۆشك و تەلارەکان، لە هەموو ڕووکارێکدا ڕووبەڕووی بووەتەوە، لە ئافرەتانی قەشەنگی مەیدانەکانەوە تا دەگاتە ئایکۆنەکانی میدیا، لە هەموو دەور و زەمانێکدا یەکەمین چەمکی تاقیکردنەوەی ئادەم بریتیبووە لە ئافرەت. ئەوەی سەیرە، شەیتان توانیویەتی بەشێکی زۆر کەمی مرۆڤەکان لە ڕێگەی ئینکارەوە هەڵ بخەڵەتێنێت و بەرەو کوفر بیانبات، کەچی توانیویەتی بە فیتنەی ئافرەت کە وەك یەکەم چەکی فیسق بەکاری هێناوە، بەشێکی زۆری مرۆڤەکان لەنێو ژیانی ڕۆژانەیاندا ڕاو بکات و وردە وردە بە خراپکردنی دڵ و ڕۆح لەسەر حسابی نەفس، وەك کۆیلەیان لێ بکات و لەژێر فەرمانی خۆیدا ئازادیان نەکات.

دەبینین ئەمڕۆ بۆ وەرگرتن و بەردەوامیدان بە تێگەیشتنی دونیایی ماددەگەرایی، ئافرەت لە ڕیزەکانی پێشەوەدا بەکار دەهێنرێت. لە ڕیکلامی هەر بەرهەمێکەوە بیگرە تا دەگاتە هەموو جۆرە بەبەتێکی خۆش و کات بەسەربردن، لە زۆرێك لە بوارەکاندا ئافرەت وەك هێزی داینەمۆی سەرفکردنی کاڵاکان بەکار دەهێنرێت و، لە پێگەی کاریگەرترین چەکی شەیتاندا خۆی دەبینێتەوە. لەمڕۆدا هەرکەسێك بچێتە ناوجەرگەی ژیانەوە و هۆکارەکانی پەیوەندی بەکار بهێنێت، ئەستەمە ڕووبەڕووی دیمەنە حەرامەکان نەبێتەوە. شەیتان و لایەنگرانی سڵ ناکەنەوە لە بەکارهێنانی ئەم چەکە کە خاوەنی هێزێکی گەورەی کاریگەرییە، کاتێك مرۆڤ دەکەوێتە داویانەوە، یەکەمین هەنگاو دەبڕێت بۆ چوونە نێو حەرام، هەموو دونیاییبوونێکیش دوا بە دوای ئەمە سەر هەڵدەدات.

کاتێك ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری ئازیزمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) کە دەفەرموورێت "نەزەر (ڕوانین) یەکێکە لە تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان"[1] بە بیر دەهێنینەوە لەگەڵ ئەوەی کە ئێرۆس لە یۆناندا وەك خواوەندی خۆشەویستی نیشاندراوە و کەسی مەبەستی بە تیر ڕاوکردووە، ئەو کات بەڕوونی ئەو ڕاستییە دەبینین کە بە ڕوانینی مرۆڤ، تیرێك بەر مرۆڤ خۆی و دەماخ و دڵی دەکەوێت. ئازیزمان سەرەتا و ڕاستەوخۆ بۆ حەزرەتی عەلی و دووەمیش بەهۆی ئەوەوە بۆ سەرجەم ئوممەتەکەی لەو بارەیەوە دواوە و فەرموویەتی "ئەی عەلی، یەکەم ڕوانین قابیلی لێخۆشبوونە، بەڵام دووەمیان قابیلی لێخۆشبوون نیە"[2] سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشاوین کە لەبەر ئەوەی بە مەبەست نەبووە، یەکەم ڕوانین بەرپرسیارێتی نییە، بەڵام ئاوڕدانەوە و ڕوانینی دووەم جار، لەبەر ئەوەی بە ئیرادەی مرۆڤ خۆیەتی، لە خانەی گوناهی ئەو کەسەدا دەنووسرێت، پێویستیی داخستنی ڕێگای چوونەوە سەر گوناهەکانی بۆ دووپات کردووینەتەوە.

واتە گەر یەکەمین ڕوانین کە بە ئیرادەی مرۆڤ خۆی نییە گوناه نەبێت، لە ڕوانینەکانی دووەم و دواتردا لەبەر ئەوەی ئیرادە بەگەڕ دەخرێت، نەفس ڕۆڵی تێدا دەبینێت و ئەم ڕوانینەش لەبەر ئەوەی وەك یەکەمین ئەڵقەی ئەو زنجیرە وایە کە مرۆڤ هەڵدەگرێت و دەیبات، بە حەرام هەژمار دەکرێت.[3] ئازیزمان هەر لە سەرەتاوە ڕێگای چوونە سەر حەرام قەدەغە دەکات و ڕێگا بە گوناهەکان نادات. سەرەڕای ئەوەش بەیانی پڕ ستایشی خوای گەورەمان

---

١. الترغيب والترحيب، ٣/٣٤. (لە ڕیوایەتی تەبەرانی و حاکەوە)

٢. الترمذي، الأدب ٢٨؛ أبو داود، النكاح ٤٢.

٢. لە سێبەری باوەڕدا - ٢، ٣٥؛ بابەتە ناسۆییەکان، ٢٥٦.

پێ دەگەیەنێت كە دەفەرمووێت "ئەوەی لە ترسی من واز لە ڕوانینی حەرام بهێنێت، نەشوە و خۆشییەكی ئیمانیی وەها دەخەمە دڵیەوە، تا قووڵاییەكانی دڵی هەست بە چێژەكەی بكات."[1] بەم شێوەیە هانمان دەدات چاوەكانمان لە حەرام بگرینەوە و بیانپارێزین.

ئەو بەیانەی كە ئازیزمان كردوویەتی و فەرموویەتی لەپاش خۆی فیتنە (تاقیكردنەوە)یەكی گەورەتر لە تایەفەی ئافرەتانی بۆ ئوممەتەكەی جێ نەهێشتووە، گەلێك پڕ مانایە. ئەسمای كچی یەزیدیش (رضي الله عنها) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت "زۆربەی شوێنكەوتەكانی دەججال پێكهاتوون لە یەهوودییەكان و، ئافرەتان و، (لادێیی) بەدەوییەكان."[2]

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (رضي الله عنه) ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوای (عليه أفضل الصلاة وأتم التسليم) ڕیوایەتكردووە، "ئافرەتان لە هەموو كەس زیاتر دەبنە شوێنكەوتەی دەججال. تەنانەت مرۆڤ وای لێدێت خزم و، دایك و، خوشك و، كچ و، پوری خۆی لە ترسی شوێنكەوتەیی دەجال بە گوریس دەبەستێتەوە."[3]

دیسان لەنێو فەرموودەكانی فیتنەدا ئەم دەربڕینە دەبینین "دەججال، شوێنی نێوەی لەنێو خێزانەكاندا گرتەوە"[4] لەمەوە تێ دەگەین كە لە ئاخرزەماندا دەججال لە ڕێی هۆكارەكانی پەیوەندییەوە دەچێتە هەموو ماڵێك و لە تەمەنێكی منداڵدا بە ئارەزووی خۆی مێشكەكان ئاراستە دەكات و شێوەیان پێ دەبەخشێت. لە دەربڕینەكانی عاریفی بەناوبانگ موحیەدینی

١. أحمد بن حنبل، المسند ٢٦٤/٥.

٢. الهيثمي، مجمع الزوائد ٣٤٧/٧.

٣. أحمد بن حنبل، المسند ٦٧/٢.

٤. مسلم، الفتن ٣٤ (٢٨٩٧) ٣٨.

ئیبنی عەرەبیشدا ئەم دەربڕینەمان بەرچاو دەکەوێت "دەججال هاتووەتە نێو ماڵەکانتانەوە و منداڵەکانتانی دەستەمۆ کردووە."[1]

لەمەوە تێ دەگەین لەو بیٔابڕووییەدا کە بەتایبەت لە ئاخرزەماندا لە ڕێگەی هۆکارەکانی گەیاندنەوە بڵاو دەبێتەوە، ئافرەت ڕۆڵێکی باڵای دەبێت. ئەوانەی گوێیان لێی بووە، ئەم وتانە "محەممەد لوتفی"یەوە دەگێڕنەوە کە زاتێکی ڕێبازی تەسەوفی شاری ئەرزڕۆمە "کاتێك ئاخرزەمان نزیك دەبێتەوە، لە هەموو ماڵێکەوە پەنجەرەیەك بە ڕووی دەرەوەدا دەکرێتەوە، دەڵێن ئەو کاتەش کۆمەڵێك ژنیاری کچ لە پەنجەرەکەوە دەردەکەون و بەدەم ژنینەوە سەما دەکەن، هەموو دانیشتووانی ماڵەکەش چاو دەبڕنە ئەو پەنجەرەیە و ڕۆژان و شەوانیان بەو شێوەیە بەسەر دەبەن. دەڵێن دواتریش مەسیحێکی درۆزن بە ناوی دەججالەوە پەیدا دەبێت، هەموو ئەوانە هەڵ دەخەڵەتێنێت کە ئیمانیان پتەو نییە! هەموو نیعمەتێکی دونیای لە لا دەبێت. لەم کاتەشدا ئەو زاتەی کە ڕێبەری موسڵمانانە و بە "مەهدی" ناو دەبرێت، لەگەڵ کۆمەڵێك باوەڕداردا تەقەلا دەدات تا مرۆڤەکان لە شەڕی دەججال ڕزگار بکات".

هاوشێوەی ئەمە مامۆستا بەدیعوززەمانیش ئاماژەی بەوە کردووە کە گەورەترین فیتنە (تاقیکردنەوە) ی ئاخرزەمان ئافرەت دەبێت ئەمەش دووبارە سەرنجمان بۆ لای ئەم خاڵە ڕا دەکێشێتەوە. دەبینین دەستەی ئیفساد بۆ جۆشدانی ئەم فیتنەیە بە پلانێکی دیاریکراو لە کارکردندان.

"بۆ زیانگەیاندن بە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئیسلامییەت و بەو بۆنەیەشەوە بە ئایینی ئیسلام و، لەرێدەرکردنی گەنجان و کێشکردنی هەوا و هەوەسیان بۆ

---

١. محي الدين العربي، الفتوحات المكية ١٦٨/٢.

شێتگیری، یەك دوو دەستە لە کارکردندان. بە هەمان شێوە، بۆ پەلکێشکردنی تەنانەت بەشە غافڵەکەی تایەفەی بێچارەی ئافرەتانیش بۆ سەر ڕێگا هەڵەکان، هەستم کرد یەك دوو دەستە بە شێوازێکی کاریگەر و لەژێر پەردەدا لە کارکردندان. وە زانیم کە: ئەمە کودەتایەکی خەتەرناکە بۆ سەر میللەتی ئیسلام، لەو ئاڕاستەیەوە دێت."[1]

لەکاتێکدا ئەم دەربڕینە ئاگادارکەرەوانەی تایبەت بە ئاخرزەمان، ڕێگاکانی دوورکەوتنەوەمان لە فیتنە پێ نیشان دەدەن، شێوازی سەلامەتبوونیشمان لە یارییەکانی دەجَّال بۆ ڕوون دەکەنەوە و دەبنە دروشمی ئەو ئیماندارانەی کە پاکیزەییان لە سەلامەتیدا دەهێڵنەوە. گەورەیی ئەو پاداشتەی کە بەپێی گەورەیی فیتنەکە لە بەرامبەر دوورەپەرێزیلێکردندیدا بە مرۆڤ دەبەخشرێت، دەبێتە مژدەیەك بۆ ئیمانداران. دوورەپەرێزیکردن لە حەرام دەرگایەکی پاداشتە کە تەنها بە بەجێهێنانی سوننەتەکان بەدەستهێنانی ئەستەمە، ڕێگایەکی خێرای پێشکەوتنە لە ژیانی مەعنەویدا و ئەگەری بوونە برای پێغەمبەری خواش بەم شێوەیە هاتووەتە بەردەم ئیمانداران. جەنابی حەق سەرکەوتوومان بکات بۆ گرتنەبەری ئەم ڕێگایە و دووربوونمان لە فیتنەی ئاخر زەمان. ئامین.

### بێ مۆڵەت خواستن مەیە ژووری!

ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! با کۆیلەکانتان و منداڵە باڵغنەبووەکانتان لەم سێ کاتەدا بەبێ مۆڵەت خواستن نەیەنە ژوورەوە بۆ لاتان:

١. پێش نوێژی بەیانی.

---

١. بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، بریسکەکان.

۲. نیوەڕۆ لەو کاتەدا کە جلەکانتان دادەکەنن و قەیلولە دەکەن.

۳. پاش نوێژی خەوتنان واتە کاتی نووستن، ئەم کاتانە کاتی مەحرەمن بۆ ئێوە. بێجگە لەمانە و لە کاتەکانی تردا ڕێگرێك نییە.[1]

خوای پەروەردگار (جَلَّ جَلَالُهُ) سەرەڕای نزیکیيان، لەو کاتانەدا هاتنەژوورەوەیانی وابەستەی مۆڵەتخواستن کردووە.

---

۱. سورەتی النور: ۵۸.

# حوکمەکانی تەماشاکردنی حەرام
# لە ئایینەکەماندا بریتین لە چی؟



## با ئیمانداران چاوەکانیان لە حەرام بپارێزن

لە قورئانی پیرۆزدا دوو ئایەت هەن کە بە پلەی یەکەم پەیوەندییان بە بابەتی کتێبەکەمانەوە هەیە. با سەرەتا تەفسیری ئەم دوو ئایەتە بخەینە ڕوو. دواتریش باس لە شیکار و بۆچوونی زاناکانی ئیسلام بکەین لەمەڕ ئەو ئایەتە پیرۆزانە. دواجاریش پێمان خۆشە تەفسیری چەند ئایەتێکی پیرۆز بهێنین کە باس لە پاراستنی چاوەکان دەکەن و ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە بابەتەکەمانەوە هەیە.

﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَـٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَـرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ

أَيْمَـٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّـٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾

(النور: ٣٠-٣١)

"بە پیاوانی ئیماندار بڵێ ڕوانینیان کەم بکەنەوە و شوێنی ئەدەبیان دەرنەخەن و لە زینا بیپارێزن. ئەمە گونجاوترین هەڵسوکەوەتە بۆ ئەوان. بێگومان خوا ئاگاداری سەرجەم ئەو شتانەیە کە ئەنجامی دەدەن. بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ ڕوانین کەم بکەنەوە و شوێنی ئەدەبیان لە گوناه بپارێزن! دیسان پێیان بڵێ بێجگە لەو شوێنانەی کە بەناچاری دەردەکەون، با جوانیی خۆیان دەرنەخەن. سەرپۆشەکانیان بە شێوازێك بپۆشن سەر یەخەیان داپۆشێت. جوانییەکانیان بێجگە لە مێردەکانیان و، باوکانیان و، باوکانی مێردەکانیان و، کوڕەکانیان و، زڕکوڕەکانیان و، براکانیان و، کوڕانی براکانیان و، کوڕی خوشکەکانیان و، ئافرەتانی ئیماندار و، ژێردەستەکانیان (کۆیلەکان) و، ئەو خزمەتکارانەیان کە لە پیاوەتی کەوتوون و پێویستییان بە ئافرەتان نییە یاخود ئەو منداڵانەی هێشتا شوێنە مەحرەمەکانی ئافرەتان نازانن، نیشانی کەس نەدەن. نابێت قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەویدا تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت و بزانرێت کە خشڵدار و زینەتدارن. ئەی ئیمانداران! هەمووتان پێکەوە تەوبە بکەن تا بگەنە سەرکەوتن."

با لەپێشدا لەو ڕووداوانە بڕوانین کە پەیوەندییان بە هۆکاری هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە هەیە:

١. بەپێی ئەو هەواڵەی لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە گەیشتبوو، ئەسمای کچی مەرسەد لە باخچەیەکی خورمای تایبەت بە خۆیدا بوو. هەندێك

ئافرەت بەبێ داپۆشینی تەواوەتیی خۆیان چوونە ژوورەوە بۆ لای، بە شێوازێك پێ و پوزیان دەرکەوتبوو و، سنگ و قژیشیان دیاربوو. لەسەر ئەمە ئەسما وتبووی "ئەمە چ دۆخێکی ناشرینە!" یەکێك لە هۆکارەکانی هاتنەخوارەوەی ئایەتە پیرۆزەکە ئەم ڕووداوە بوو. [1]

٢. دووەم ڕووداو: "إبن مردوية" لە حەزرەتی عەلییەوە (رضي الله عنه) بۆمان دەگێڕێتەوە: لە سەردەمی پێغەمبەری ئازیزماندا (صلى الله عليه وسلم)، کابرایەك لە یەکێك لە ڕێگاکانی مەدینەدا تەماشای ئافرەتێکی کرد. ئافرەتەکەش تەماشای ئەوی کرد. بۆ ئارەزووکردنیان لە یەکتر، شەیتان لە شێوەی لەیەکڕوانینەکەیاندا وەسوەسەی پێدان. کابرا کاتێك لەو ئافرەتەی دەڕوانی لە پاڵ دیوارێکەوە ڕەت دەبوو، لەناکاو دیوارێکی تر هاتە بەردەمی و خۆی پێدا کێشا و، لوتی برینداربوو. کابرا لەسەر ئەمە وتی:

- سوێند بێت ئەم خوێنە ناسڕم تا نەچمە لای پێغەمبەری خوا و دۆخەکەی بۆ نەگێڕمەوە. کاتێك هاتە لای پێغەمبەر و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، ئازیزمان (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:

- ئەمە سزای گوناهەکەی تۆیە، پاش ئەمەش جەنابی حەق ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە "بە ئیمانداران بڵێ، چاوانیان دا بخەن." [2]

٣. سێهەم ڕووداویش سەبارەت بە دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزانە بریتییە لەمە: بەپێی ڕیوایەتی ئەبو جەریر، جارێکیان ئافرەتێك دوو پارچە زیو و زنجیرێکی زێڕی پێوە بوو و، بە لای کۆمەڵێك خەڵکدا تێدەپەڕی. کاتێك پێی

---

١. إبن كثير، التفسير ٢٨٣/٣؛ السيوطي، الدر المنثور ١٠٤/٥.

٢. سيوطي ٤٠/٥.

بە زەویدا دەنا، ئەم خشڵانە بەر یەك دەکەوتن و دەنگیان دروست دەکرد. لەسەر ئەمەش جەنابی حەق ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە "با پێیان بە زەویدا نەدەن"[١].

## وردەکاریی ئایەتەکان

یەکەم: حیکمەتی ئەوەی کە خوای گەورە "پاراستنی چاوەکان" ی خستووەتە پێش "پاراستنی داوێنەکان"ەوە بریتییە لەمە: تەماشاکردنی ئافرەت دەمڕاستی زینا و پێشڕەوی خراپەکانە. وەك زانای تەفسیر "القاسمي" دەڵێت "لەبەر ئەوەی ڕوانینەکان نێردراوی دڵن، ئەو دیمەنانەی دەیبینیت خەمبارت دەکەن. چونکە ناتوانیت هەموو ئەوە بکەیت کە دەیبینیت، ناشتوانیت بەرگەی هەندێك لەوانە بگریت کە دەیبینیت." بەڵێ، ڕەنگە بە ڕوانین ئالودەی حەرامەکان ببیت. چاو گەورەترین دەرگایە کە هەموو شتێك بە دڵ دەگەیەنێت. لەبەر ئەوە مرۆڤ لە ڕێگەی چاوەوە دەکەوێتە زۆر گوناهەوە. چونکە ڕوانین دەبێتە خەندە، خەندە دەبێتە سڵاو و، سڵاویش بۆ گفتوگۆ و، گفتوگۆ بۆ ڕێککەوتن و، ڕێککەوتنیش دەبێتە هۆکار بۆ پێکەوەبوون و نزیکبوونەوەیەکی ناشەرعی.

وردەکاریی دووەم: فەرمانی "با چاویان بپارێزن"، بۆ هەموو شتێك نییە، بەڵکو تەنها پەیوەندیی بەو شتانەوە هەیە کە خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) حەرامی کردوون.

وردەکاریی سێهەم: دەربڕینی "با جوانی خۆیان دەرنەخەن" لە ئایەتە پیرۆزەکەدا، گوزارشت لە داپۆشینی ئەو شوێنە دەکات کە خشڵیان پێوە

١. وهبة الزحيلي، تفسير المنير، سورة النور ٣٠-٣١، تفسير الايات.

دەکرێت، بە جۆرەش داوا دەکات کە خشڵ و جوانکارییەکان داپۆشرێن. زەمەخشەری دەڵێت "دانای باسکردنی جوانییەکان لە ئایەتەکەدا بریتییە لە پێویستی پاراستن و داپۆشینی جوانییەکان، کاتێك خوای گەورە دەفەرمووێت "با جوانییەکانیان دەرنەخەن" لەڕاستیدا مەبەستی لەوەیە شوێنی خشڵ و جوانییەکانیان دەرنەخەن، چونکە حەرامنییە خشڵ ببینرێت گەر بە جەستەی ئافرەتەوە نەبێت، هەربۆیە پێویست ناکات خشڵ قەدەغە بکرێت، مانای وایە ئەوەی لەڕاستیدا قەدەغە کراوە شوێنی ئەو خشڵ و بابەتی جوانکارییانەیە"[١]

وردەکاریی چوارەم: بەگوێرەی هەندێك لە زاناکان، وەك چاو، بە گوێچکەکانیش چێژ وەردەگیرێت. هەر لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی "نابێت پێ بدەن بە زەویدا تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت و بزانرێت کە زینەتدار و خشڵدارن." چونکە ئەو سەردەمە ئافرەتان کە لە کاتی ڕۆیشتندا پێیەکانیان بە زەویدا دەدا، دەنگی ئەو خشڵ و پاوانەیە دەهات کە کردبوویان بە قاچیانەوە. ئەم دەنگە، هەواڵی هاتنی ئافرەتێکی دەدایە پیاوان و، ئارەزووە شەهوانییەکانیانی دەجوڵاند. لەبەر ئەم هۆکارە دەربڕینەکە گوزارشت لەوە دەکات کە دەرخستنی شوێنی خشڵدار -تەنانەت گەر قاچیش بێت- حەرامە. بەکورتی، هەر بۆیە ئەو عەتر و بۆن و شێوازی ڕۆیشتن و قسەکردنە سەرنجڕاکێشانەی کە شەهوەت دەجوڵێنن، قەدەغەن. چونکە جەنابی حق فەرموویەتی:

﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴾ (الاحزاب: ٣٢)

---

١. الكشاف الزمخشري، ٣/٢٣٠.

"ئەی ژنانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئێوە وەك هیچ یەك لە ئافرەتانی دیکە نین ئەگەر خۆتان بپارێزن و لەخوا بترسن کەواتە بە غەمزە و نازەوە قسە مەکەن نەوەك ئەوەی کە دڵی نەخۆشە (دەروونزمە) نیازی خراپ بکات و، قسەی چاك و بەجێ بکەن"

با ئێستاش لە کتێبەکانی تەفسیردا لە کورتەی تەفسیری بابەتەکانی نێو ئەم ئایەتانە بڕوانین:

"ئیسلام ئامانجی ئەوەیە کۆمەڵگایەك پێك بهێنێت کە تیایدا چێژەکان هەڵناچن و لە گۆشت و خوێنێکن کە هەستە شەهەوییەکانیان ناوروژێن بەرەو خراپە. چونکە ڕووبەڕووبوونەوەی دۆخی فریوخواردنی بەردەوام و وروژان، سەرەنجامەکەیان تێرنەبوونێکی شەهەوییە کە لە هیچ دۆخێکدا قایل نابێت. ڕوانینێکی بانگهێشتکار، جوڵەیەکی فریودەر، خشڵێکی ڕەونەقدار و جەستەیەکی ڕووت. هەموو ئەمانە بێجگە لە بزواندنی تێرنەبوونێکی ئاژەڵی و نائەخلاقی و، لەدەستدەرچوونی لغاوی عەقڵ و ئیرادە، ئەنجامێکی تریان لێ لەدایك نابێت. لەپاش ئەمە، یان بەرەڵایی ڕەها یانیش تێرنەبوون سەرەڕای لەڕێ لادان، نەخۆشییە دەمارییەکان و کۆمپلێکسە سایکۆلۆژییەکان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن و ئەشکەنجەی مرۆڤ دەدەن.

یەکێك لەو ڕێگایانەی ئیسلام بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی پاڵێوراو لە هەموو جۆرە پیسییەك پەنای بۆ دەبات، بریتییە لە بەرگرتن لەم هەڵسوکەوتە فریودەر و لەڕێلادەرانە و، هێشتنەوەی ئارەزووی قووڵ و فیتری نێوان دوو ڕەگەز بە هێزی سروشتی خۆیەوە و دوور لە بزواندنی بە وروژانی دەستکرد و تێرکردنی ئەم ئارەزووە لە شوێنی سەلامەت و خاوێنی خۆیدا.

سەردەمانێك بیرۆکەی ئەوە سەری هەڵدابوو کە گوایە تەماشاکردنی

یەكتری و گفتوگۆی ئازادانەی هەردوو ڕەگەز لەگەڵ یەكدا، دەبێتە مایەی بەتاڵبوونەوەی مرۆڤەكان و، ئاسوودەبوون و حەوانەوەیان و، پاراستنیان لە گۆشەگیری و كێشە ڕۆحییەكان و، كەمبوونەوەی فشاری جەستەیی و نەمانی ئەو كاردانەوە نەرێنییانەی كە بێمتمانەیی دەردەخەن. ئەم بیرۆكەیە هەروەك بیرۆكەكەی فرۆید، داماڵینی مرۆڤە لەو تایبەتمەندییانەی كە لە ئاژەڵ جیای دەكەنەوە و، لەپاش بڵاوبوونەوەی هەندێ تیۆری پشتبەستوو بە بناغەی نزمبوونەوە بۆ ئاستی ئاژەڵێتی نوقومبوو لە قوڕدا بڵاوبوویەوە. ئەوە هەیە كە ئەم بیرۆكانە تەنها لە چوارچێوەی چەند تیۆرییەكی گۆترەییدا ماونەتەوە. لەو وڵاتانەدا كە هەموو بەندێكی كۆمەڵایەتی و، ئەخلاقی و، ئایینی و، مرۆیی داماڵراوە و، وا دەزانرێت كە تا دوا سنوور ئازادی پەیڕەو دەكرێت، چەندین ڕووداو دێنە كایەوە كە بەرپەرچی ئەم تیرۆرییانە دەدەنەوە و، لە بناغەوە ڕیشەیان دەردەهێنن.

بەڵێ، لەو وڵاتانەدا كە هیچ ڕێگرییەك بۆ بەرەڵایی و، هەموو جۆرە پێكەوەبوونێكی هەردوو ڕەگەز بوونی نییە، هەموو ئەم پەریڕەوكارییانە نەیتوانیوە ڕێكییەك بۆ ویستە جەستەییەكان دەستەبەر بكەن. بەپێچەوانەوە، سەرجەم ئەم ئازادییانە تێرنەبوون و دڕندەیی جنسی دانەمركاو و برسێتی جەستەیی و نەخۆشی دەروونیی بەرهەم هێناوە.

ئەو مەیلە فیترییەی ئافرەت و پیاو بۆ یەك هەیانە، مەیلێكی ڕەگداكوتاوە كە لە پێكهاتەی ئەندامیی جەستەدایە. لەبەر ئەوەی خوای گەورە بەردەوامیی ژیانی سەر زەوی و بەرجەستەكردنی جێنشینێتیی مرۆڤی لەسەر زەویدا بەستووە بەم مەیلەوە. وروژاندنی ئەم مەیلە ئەو برسێتییە زیاد دەكات و، بۆ تێربوونیش بەرەو دڕندەیی پاڵی دەنێت. ئەگەر تێر نەبێت دەمارە وروژێنراوەكان

ماندوو دەبن. ئەمەش هێندەی ئەشکەنجەیەکی بەردەوام ئازاری مرۆڤ دەدات. ڕوانینێکی بانگهێشتکار مرۆڤ دەبزوێنێت، جوڵە و هەڵسوکەوتێکی فریودەر دەیبزوێنێت، خەندەیەك دەیبزوێنێت، قسەیەکی جوڵێنەری مەیلی نێوان ژن و پیاو دەیبزوێنێت... ڕێگای سەلامەتیش بریتییە لەوەی ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە جوڵێنەرانە کەم بکرێنەوە بە شێوازێك ئەم مەیلە لە نێو سنوورە سروشتییەکانی خۆیدا بهێڵرێتەوە و دواتریش لە ڕێگای ڕاستەوە تێر بکرێت. ئەمەش ئەو ڕێگایەیە کە ئیسلام هەڵی بژاردووە.“

بەڵێ، ڕازی جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە پارێزگاریکردنی پیاوان لە چاوەکانیان لە بەرامبەر حەرامدا ئەدەبێکی ڕۆحییە و، مل نەدانە بۆ جوانییەکانی ڕوخسار و جەستە و چەمکە فریودەرەکانی و، بگرە هەڵمەتی داخستنی یەکەمین پەنجەرەی چوونە نێو گوناهـ و لەخشتەبرانە و، هەوڵێکی پراکتیکییە بۆ ڕێگرتن لە بەئامانجگەیشتنی تیری ژەهراوی ڕوانینی حەرام. پاشان ئەم زانایەی تەفسیرمان بەم شێوازە بەردەوام دەبێت:

”پاراستنی شوێنە مەحرەمەکانیش ئەنجامی سروشتیی گێڕانەوەی چاوەکانە لە حەرام. یانیش دووەم هەنگاوی کۆنترۆڵکردنی ئیرادە و بەگەڕخستنی میکانیزمی پارێزگاری و بەزاندنی ئەو ئارەزووەیە کە هێشتا لە قۆناغی سەرەتادایە. هەربۆیە دوو هەنگاوەکە کە هۆکار و ئەنجامن، هەم لە دونیای ویژدان و هەم لە کرداریشدا شوێنکەوتەی یەکن و تا دواڕادە پشتیان بە یەك بەستووە، بەم شێوەیەش بوونەتە بابەتی باسی نێو ئایەتێك.“

ئایەتە پیرۆزەکە بەم شێوازە بەردەوام دەبێت لە فەرمانەکانی سەبارەت بە ئافرەتان:

"با ئەو ڕوانینە فریودەرانە نەگرنە پیاوان کە چەمکە شاراوەکانی فیتنە لە ناخیاندا هەڵدەسێنێت. بۆ ئەوە نەبێت کە لە ڕێگەی حەلاڵ و لە کەشێکی پاك و خاوێندا وەڵامی ویستە فیترییەکان بدەنەوە، با شوێنە مەحرەمەکانیان دەرنەخەن. بەم شێوەیە ئەو منداڵانەی بەم ڕێگایە دێنە دونیاوە لەبەرامبەر کۆمەڵگا و ژیاندا هەست بە شەرمەزاری ناکەن.

خۆڕازاندنەوە بۆ ئافرەتان حەلاڵە. ئەمە لە تایبەتمەندیی وەڵامێکدایە بۆ ویستێکی فیتری کە لە بنەڕەتدا لای ئافرەت بوونی هەیە. هەموو ئافرەتان حەزیان لەوەیە جوان بن و جوان دەربکەون. هەرچی دەستەواژەی خۆ ڕازاندنەوەشە، لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەگۆڕێت. بەڵام بنچینەی فیتریی خۆڕازاندنەوە یەك شتە و ناگۆڕێت. ئەویش بریتییە لە جوانبوون و، تەواوکردنی جوانی و ویستی نیشاندانی ئەمەیە بۆ پیاوان.

ئیسلام دژی ئەم ویستە فیترییە نییە. تەنها ڕێکی دەخات و، کۆنترۆڵی دەکات. ئاڕاستەی ئەو پیاوەی دەکات کە ژیانی لەگەڵدا بەشکردووە، ئەو شتانە تەنها نیشانی ئەو دەدات کە کەسانی تر نایانبینن.

گەر شوێنە لەخشتەبەر و بزوێنەرەکانی ئافرەت بەدەرەوە بن و، لەخواترسان سڵیش لە بەردەوامی و دووبارەبوونەوەی ئەم ڕوانینە لەناکاو و نائیرادییە بکەنەوە، دواتر ئارەزوویەکی شاراوە لە ناخیاندا دروست دەبێت. بێگومان خوای گەورە نایەوێت دڵەکان بە بەڵای وەها تاقی بکرێنەوە.

ئافرەتانی ئیماندار کە دڵیان بە نووری پەروەردگار ڕۆشنە، سەرەڕای ویستی فیترییان بۆخۆڕازاندنەوە و نیشاندانی جوانی، ڕووبەڕووی ئەم قەدەغەکراوە بوونەتەوە و هیچ کەمتەرخەمییەکیان لە پابەندبوونی ئەم فەرمانەدا نەکردووە.

لە سەردەمی جاهیلیدا ئافرەت وەكو ئەم جاهیلییە مۆدێرنەی ئەمڕۆمان، سنگی بێپەروا دەردەخست و لەنێو پیاواندا دەهات و دەچوو. زۆربەی كات ملی و قژی و گوارەكانی گوێی بەدەرەوە دەبوون. كاتێك خوای پەروەردگار فەرمانی فەرموو ئافرەتان سەرپۆشەكانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا و بێجگە لەوەی كە خۆی دیارە (وەك دەم و چاو و دەست) جوانیی خۆیان دەرنەخەن، وتەی حەزرەتی عائیشەیان وەرگرت (رَضِيَ اللهُ عَنْها) "كاتێك ئایەتی "ڕەحمەتی خوا لە یەكەم ئافرەتانی كۆچكەر با سەرپۆشەكانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا" هاتە خوارەوە، كراسەكانیان پارچە كرد و خۆیانیان پێ داپۆشی."

سەفیەی كچی شەیبە (رَضِيَ اللهُ عَنْها) دەفەرمووێت: جارێكیان لە لای حەزرەتی عائیشە بووین، هەندێك ئافرەت باسی ئافرەتانی قورەیش و لەپێشیی ئەوانیان كرد. لەسەر ئەمە حەزرەتی عائیشە فەرمووی "لەپێشیی ئافرەتانی قورەیش گومانی تێدا نییە، بەڵام سوپاس بۆ خوا، لەنێو ئافرەتانی ئەنساردا ئافرەتانی وەهام بەرچاو كەوت كە باشتر كتێبی خوای گەورە پەسەند دەكەن و باشتریش بڕوایان بە حوكمە دابەزیوەكان هەیە. كاتێك ئایەتی "با سەرپۆشەكانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا" لە سورەتی "النور" دابەزی، مێردەكانیان چوونەوە لایان و ئەو ئایەتەیان بۆ خوێندنەوە كە خوای گەورە ناردبوویە خوارەوە. هەموو مێردێك ئەم ئایەتەی بۆ خێزان و، كچ و، خوشك و، نزیكەكانی خۆی دەخوێندەوە. هیچ كام لەوان، لە شوێنی خۆی هەڵنەسا تا كراسەكەی نەدا بە سەریدا، بەمەش ئایەتی پیرۆزی خوای گەورەیان پەسەندكرد و ئیمانیان دووپاتكردەوە. وەك ئەوەی قەلەڕەش بەسەریانەوە بێت، سەریان داپۆشی و لەپشت حەزرەتی پێغەمبەرەوە وەستان."[1]

---

١. أبو داود، اللباس ٢٩.

بێگومان ئیسلام ناسکیی کۆمەڵگای موسڵمانانی بەرامبەر بەجوانی خاوێنکردەوە. ئیدی ئەوەی لەگەڵ جوانیدا دەویسترا، تایبەتمەندیی ئاژەڵیی نەبوو، بەڵکو ویستراو لایەنی مرۆیی بوو. جوانیی ڕووتیی جەستەیی جوانییەکی ئاژەڵانەیە. هەرچەندە یەکگرتن و نیزیکبوونەوەش هەبێت، مرۆڤ بە هەستێکی ئاژەڵییەوە پەلاماری ئەم جوانییە دەدات. بەڵام ئەو جوانییەی کە چەمکی حەیا تیایدا زاڵە، جوانییەکی تەواو پاراو و خاوێنە. ئەم هەستی حەیایە چێژی جوانی بەرز دەکاتەوە و، دەیهێنێتە پێگەی شایستەبوونی بە مرۆڤ و لە بیر و خەیاڵدا بە هەستی خاوێنی و پاکی دەیڕازێنێتەوە.

ئەمڕۆ سەرەڕای ئەوەی کە چێژەکە بە گشتی کەوتنێکی گەورەی بە خۆیەوە بینیوە و، دیاردەکانی وەك کراوەیی ئاژەڵانە و، ڕووتی و مەیلی هەڵچوون سەرکەوتن بەسەر ئەم چێژە باڵایەدا، ئیسلام لە ڕیزی ئافرەتانی ئیمانداردا هەمان بەرزیی پەرشکردووەتەوە. چونکە ئەوان بە ویستی خۆیان شوێنە فریودەرەکانی جەستەیان داپۆشیوە.

بەبێ هیچ گومانێك، ئەم هەستی شەرم و پارێزگارییە یەکێکە لە ڕێگاکانی پارێزگاریکردن لە تاك و کۆمەڵگا. لەو کاتانەدا کە لە دووربوونی فیتنە دڵنیا دەبین، قورئان وازهێنان لەم ڕێکارانە بەئاسایی دەبینێت. هەر لەبەر ئەوە ئەو خزمە نزیکانەی لەم قەدەغەکردنانە بەدەرکردووە کە بە ئارەزوویەی شەهوەتەوە نزیك نابنەوە و، هەستە شەهەوییەکانیان ناجوڵێت.[1]

کاتێك ئافرەتانی ئازاد جوانییەکانیان بێجگە لەو کەسە دیاریکراوانە بۆ کەسی تر دەرناخەن، ئەم هەڵسوکەوتەیان لەڕوانگەی پاراستنی پاکیزەیی

---

١. فخرالدين الرازي، التفسير الكبير، سورة النور ٣٠-٣١، تفسير الآيات.

خۆیان و بەسەربردنی ژیانێکی ڕێکوپێکەوە خاڵێکی تا بڵێیت گرنگە و لە ڕوانگەی کاریگەرنەبوون لەسەر پیاوانی بێگانە و کێش نەکردنیان بەرەو گوناهـ و بەرجەستەکردنی ئەدەب و عیففەتیشەوە گرنگییەکی بەرچاوی هەیە. لەبەر ئەوە بۆ یادخستنەوەی ئەم خاڵە و دووبارە وەبیرهێنانەوەی هێز و بواری فەرمانی داپۆشین و، تەنانەت بۆ ڕێککردنەوەی شێوازی ڕۆیشتنیش دەفەرمووێت "نابێت قاچیان دەر بخەن و پێیان بدەن بە زەویدا (تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت)" واتە لە سەرەتاوە پێیەکانیان دا بپۆشن و کاتێکیش بە ڕێگادا دەڕۆن بە ئەدەب و ویقارەوە بڕۆن. با بۆ دەرکەوتنی جوانییە شاردراوەکان و خشڵەکانیان یاری بە ڕان و قاچیان نەکەن و، بە ڕۆیشتنی سەرنجڕاکێشەوە ڕوانینەکان بۆ لای خۆیان ڕانەکێشن، چونکە ئەمە پیاوان دەجوڵێنێت و، گومان دروست دەکات. بەڵام دەبێت لە یادمان نەچێت کە سەرکەوتنی ئافرەتان لەمەدا سەرەتا بەندە بە پاکیزەیی پیاوان و پابەندبوونی ئەرکەکانیان و تەقەلا و هەوڵیان لە نێو کۆمەڵگەدا، ئەمەش بە هاوکاری و دەستگیرۆیی خوای گەورە دێتە دی. لەبەر ئەوە لەم خاڵەدا پێغەمبەری ئازیزمان ڕوو دەکاتە سەرجەم موسڵمانان و بە شێوازێك سەرەتا لە پیاوان دەدوێت و دواتریش لە ئافرەتان، دەفەرمووێت:

"ئەی ئیمانداران! هەردەم تەوبەی خوای گەورە بکەن تا بگەن بە ڕزگاربوون." مانای وایە لە کۆمەڵگایەکی تێکچوودا ئومێدی ڕزگاربوون ناکرێت. هۆکاری تێکچوونی کۆمەڵگاش لەپێش ئافرەتانەوە هەڵە و کەموکورتییەکانی پیاوانە. لەبەر ئەوە پێویستە سەرەتا پیاوان و پاشانیش ئافرەتانی ئیماندار بە تەوبەکردن لەو هەڵە و کەموکورتییانەی کە لەگەڵ ئیماندا ناگونجێن و شوێنەواری جاهیلییان پێوەیە، ڕوو بکەنەوە خوا و پەنا

بۆ هاوكاریی ئەو ببەن و گرنگی بە فەرمانە پیرۆزەكانی بدەن تاوەكو بە كۆمەڵ بگەنە ڕزگاربوون. لەم كاتەدا و لە ڕوانگەی ڕزگاربوونی هەمووانەوە پێویستە خاوەنكار و كەسە پەیوەندیدارەكانیش گرنگیی بەم فەرمانانە بدەن."[1]

## هەندێك حوكم و دانایی تر كە هەڵقوڵاوی نێو ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەن، بریتین لەمانە:

١. چاوداخستن و پارێزگاریی چاو لەبەرامبەر كەسانی نامەحرەم و ئەو شتانەی كە مەترسیی فیتنەیان لێ دەكرێت، واجبە. چونكە چاو، لە بابەتی تووشبوون بە خراپە و سەرقاڵكردنی دڵ بە وەسوەسە و، بەجۆشهێنانیدا وەك كلیلێك وەهایە، نامەبەری دووچاربوونە بە فیتنە یاخود بە زینا.

٢. پاراستنی داوێن و ناموس لە ڕوانینی ئەو كەسانەی كە حەڵاڵ نییە بۆیان. هەروەها خۆپاراستن لە داوێنپیسییەكانی وەك زینا و نێربازی و دەستلێدان و لەئامێزگرتن و خوونهێنی (خۆبەتاڵكردنەوە بە دەست)، واجبە.

٣. چوونە نێو حەمام بە دانەپۆشراوی حەرامە. جارێكیان پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی "خۆتان بپارێزن لەوماڵەی پێی دەڵێن حەمام!" كاتێك لەسەر ئەمە وترا كە حەمام پیسییەكان دەبات و دۆزەخ بە یاددا دەهێنێتەوە، ئازیزمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی "ئەگەر هەر ئەمە دەكەن، بەداپۆشراوی بچنە ناو حەمام."

٤. داخستنی چاوەكان بەرامبەر بە حەرام و، پاراستنی داوێن، سەلامەتترین

---

١. محمد حمدی یازر، دین الحق، لغة القرآن، سورة النور، تفسیر الایة ٣١.

ڕێگایە لە ئاییندا و، لە گەیشتن بە پیسیی گوناهەوە دوورترە. خوای پەروەردگار کردەوەی بەندەکانی و، نیەتی دڵەکانیان و، چرپەی زمانیان و، هەموو جوڵە و مامەڵەیەکی چاو و گوێچکەکانیان زۆر بەباشی ئاگادارە و دەیزانێت. هیچ شتێك لەو ناشاردرێتەوە. هاوتای هەموو کردەوەکان دەداتەوە بە مرۆڤ.

٥. خوای گەورە بۆ ئەوەی دووچاری فیتنە نەبن، فەرمانی بە ئافرەتان کرد بێجگە لە دەموچاو و دەستیان، جەستەیان دا بپۆشن و نیشانی ئەوانەی نەدەن کە تەماشای جوانییەکانیان دەکەن.

٦. لەبەر ڕۆشنایی ئایەتی "با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا"دا، فەرزە لەسەر ئافرەت کە قژ و مل و سنگی دا بپۆشێت. لە ئایەتەکەدا وشەی (خمر) بە واتای ئەو سەرپۆشە دێت کە ئافرەت سەری پێ دادەپۆشێت.

٧. حەرامە بۆ ئافرەتان پیاوان بەرەو فیتنە و فەساد بدەنە بەر و، جلوبەرگی کراوە بپۆشن و، پێ بە زەویدا بدەن و، کاتێك لە ماڵ دەردەچن بۆن لە خۆیان بدەن و، خۆیان برازێننەوە و کردەوەی تری هاوشێوەی ئەمانە ئەنجام بدەن کە فریودەری پیاوان بێت. مەکروهیشە ئافرەت بە خشڵەکانییەوە دەنگ دروست بکات و قاچ بە زەویدا بدات.

٨. ئەو سیستەمی پەروەردەیەی کە ئیسلام هێناویەتی، هەم شکۆ و ناموسی خێزان، هەم کۆمەڵگای موسڵمانان دەپارێزێت.

٩. تەوبەکردنی پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار بەبێ بوونی هیچ جیاوازییەك لە نێو ئوممەتدا، واجبە و فەرزێکی بێگومانە. چونکە هەموو مرۆڤێك ئاتاجی تەوبەیە. لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە کاتی بەجێهێنانی مافەکانی خوای گەورەدا

لە هەڵە و کەموکورتی بەدوور نابێت. هەربۆیە نابێت لە هیچ بارودۆخێکدا واز لە تەوبە بهێنێت. پێویستە مرۆڤ لە هەموو یادهاتنەوەیەکی گوناهەکانیدا تەوبە نوێ بکاتەوە. چونکە دەبێت مرۆڤ تا ئەو کاتەی دەگاتەوە بە خوای پەروەردگار لە پەشیمانی و عەزمیدا بەردەوام بێت.

مەرجەکانی تەوبە چوارە:

- وازهێنانی تەواوەتی لە گوناهەکە.
- پەشیمانبوون لەوەی لە ڕابردوودا کردووتە.
- سووربوون لەسەر ئەنجامنەدانەوەی.
- گێڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان.[1]

لە ئایەتێکی تری پەیوەندیدار بە بابەتەکەماندا، هەندێك کارئاسانی لە بابەتی داپۆشیندا بۆ ئەو ئافرەتانە کراوە کە بەساڵداچوون و لە سوڕی مانگانە وەستاونەتەوە و چیدی لە لایەنی شەهوەتەوە ویستیان بۆ پیاوان نییە. لە ئایەتەکەدا خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ (النور: ٦٠)

"ئەو ئافرەتە پیرو پەککەوتانەی کە بەتەمای شووکردن نین، کێشە نابێت ئەگەر هەندێك لە پۆشاکیان دابنێن، لەکاتێکدا جوانیی خۆیان

---

١. وهبة الزحيلي، تفسير المنير، سورة النور ٣٠-٣١، تفسير الايات.

دەرنەخەن، خۆ ئەگەر پۆشتە بن ئەوە چاكترە بۆیان، خوایش بیسەر و زانایە (بە نیەت و خەتەرە و خەیاڵی دڵەكان).“

بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەو ئافرەتانەی بەتەمەنن و لە سوڕی مانگانە وەستاونەتەوە و، سەرنجڕاكێشیی جەستەییان لەدەستداوە و، لە هەلومەرجی ئاساییدا داوای هاوسەرگیرییان لێ ناكرێت، دەتوانن بە گوێرەی گەنجەكان كەمتر خۆیان دا بپۆشن، بە دەربڕینێكی تر دەتوانن هەندێك لە پۆشاكیان دابنێن. ئاگاداركردنەوەكەی كۆتایی ئایەتەكە ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئافرەتان گەر پیریش بن، لەبەر بوونی ئەگەری ڕاكێشانی سەرنج بۆ لای خۆیان، دەبێت لە بەكارهێنانی ئەم دەرفەتەدا ئاگادار بن و بەپێی ئامانجەكە هەڵسوكەوتی لەگەڵدا بكەن.

دەبێت ئافرەتان لە دەرەوەی ماڵ یاخود لە لای پیاوی بێگانەدا بەسەر پۆشاكی ئاسایی ناوماڵیاندا بەرگێكی تری باڵاپۆش بپۆشن. خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئەمەمان پێ ڕادەگەیەنێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾

(الأحزاب: ٥٩)

"ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرانت و كچەكانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: كە بە پۆشاكی باڵاپۆش خۆیان دا بپۆشن ئەوە لەبارترین شتە كە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و (تووشی گیروگرفت نەبن)، هەمیشە و بەردەوام خوا بەخشەر و میهرەبانە (لە كەم و كووڕی ڕابوردووتان خۆش دەبێت).“

بەڵێ، لە نێو عەرەبەكانی جاهیلیدا، ئافرەتان گرنگییان بە خۆداپۆشین

نەدەدا. ئەو ژنانە زۆربوون کە بە جەستەی دانەپۆشراویان سەرنجی کوڕانیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا. ئەم ئافرەتانە لەبەر ئەوەی ئومێدیان دەدایە کوڕەکان، لە لایەن ئەوانەوە گرنگییان پێ دەدرا. ئیسلام بۆ بەرزڕاگرتنی شکۆی ئافرەت و، ڕێگەنەدان بە بێزارکردنیان لە لایەن پیاوە بێئابڕووەکانەوە، وەك نیشانەیەکی پاکیزەیی بۆیان فەرمانی بە داپۆشینیان کرد. لەو ئایەتەی قورئانی پیرۆزدا کە فەرمان بە داپۆشین دەکات، وشەی "جلباب" بە واتای (بالاپۆش) بەرگێکە کە گەر چاوان کراوەش بن، بەشێکی زۆر لە دەموچاو و گەردن و سەرجەم جەستە دادەپۆشێت.

دەمانەوێت لێرەدا چەند ئایەتێکی تری پەیوەندیدار بە بابەتەکە بخەینە ڕوو:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ (الإسراء:٣٦)

"(ئەی مرۆڤ) لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەرهەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە."

﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴾ (غافر: ١٩)

"ئەو خوایە هەمیشە چاوە خیانەتکار و ناپاکەکان دەناسێت و دەزانێت چی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە."

﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ﴾ (الفجر: ١٤)

"بەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەمیشە و بەردەوام ئامادەیە کە تۆڵە لە ستەمکاران بسێنێت."

لێرەدا لە شوێنی خۆیدا دەبێت گەر ئەم باسانەی زانای گەورەی تەفسیر "ئەلمالی"ش بهێنین کە لەمەڕ دۆخی ئەمڕۆی ئافرەت خستوونیەتە ڕوو:

"ئامانج و پەرستراوی ڕۆحی موشریك ئافرەتە. لە ڕوانینی ئەودا گەورەترین نمونەی تەعەببود، تەعەببودی ئافرەتانە. ئەو دەیەوێت هەموو چێژ و، هەموو ئیلهامی لە ئافرەتەوە وەر بگرێت، چێژی ئافرەت لای ئەو دەبێتە گەورەترینی هەموو چێژەکان. بۆ ئەو، لە سەری سەرەوەی هەموو خەیاڵاتیدا خەیاڵی ئافرەتێك هەیە. ئەم حاڵە تاریکستانێکی وەهای گومڕایان و دەسیسەیەکی وەهای شەیتانەکانە، بە جۆرێك هەر شتێکیان خۆش بوێت بەدڵنیایییەوە وێنایەکی ئافرەتی لەگەڵدا تێکەڵ دەکەن. خۆر دەپەرستن وێنای مێیینەی بۆ دەکەن. ئەستێرە دەپەرستن، وێنای مێیینەی بۆ دەکەن. فریشتە دەپەرستن، وێنای کچ دەکەن و بەم شێوەیە هەموو چێژی تەعەببودییەت لە شەهوەتدا کۆ دەکەنەوە و حەق و ڕاستییەکان دەکەنە فیدای خەیاڵ و لەبەرامبەر خەیاڵی ئافرەتدا ئافرەتە ڕاستییەکان لەژێر پێ دەنێن."

## ئەو جوانییە چییە کە دەرخستنی حەرامە؟

ئایەتی "با جوانییەکانیان دەرنەخەن." گوزارشت لەوە دەکات کە دەرخستنی جوانییەکانی ئافرەت لەبەرامبەر پیاوی بێگانەدا بۆ ئەوەی نەبێتە ڕێخۆشکەر بۆ فیتنە، خوای گەورە حەرامی کردووە.

لەڕاستیدا زینەت بریتییە لە بەرگ و پۆشاکی ئافرەت لەگەڵ خشڵ و کەرەستەی جوانکاری و بابەتی خۆجوانکردن و میکیاژ. لەگەڵ ئەمەدا زینەت دوو جۆرە. یەکەمیان ئەو جوانی و زینەتەیە کە لە خواییەوە هەیە،

دووەمیان زینەتی بەدەستهاتووە. ئەو زینەتەی کە خواییە، بریتییە لە جوانی پێست و باڵا و ئەندام و دەموچاوی ئافرەت. هەرچەندە هەندێك لە زانایان بڕوایان وابووە ئەو جوانییە زینەت نییە کە لە دروستبوونەوە هەیە، بەڵام ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە زینەتی سەرەکی ئافرەت بریتییە لەو جوانییەی کە خۆی لە دروستبوون و خواییەوە هەیەتی. لەبەر ئەمەیە کە خوای گەورە فەرمانی فەرمووە "سەرپۆشەکانیان مل و سینەیان دا بپۆشێت". خوای پەروەردگار بەم ئایەتە فەرمان دەکات ئافرەتان بەشەکانی جەستەی وەك قژ و سنگیان دا بپۆشن. مادەم وایە ئەم ئایەتە ئاماژە بەوەش دەدات کە مەبەست لە زینەت جوانییە خواییەکانە.

ئەوە ڕوونە کە تەماشاکردنی زینەتەکانی وەك جلوبەرگ و گوارە و ملوانکە بە جیا لە جەستەی ئافرەت، حەرام نییە. ئەوەی کە حەرامە تەماشاکردنیانە لەپاش ئەوەی دەکرێن بە جەستەی ئافرەتەوە. گەر تەماشاکردنی ئەو زینەتە حەرام بێت کە دەکرێت بە ئافرەتەوە، بێگومان تەماشاکردنی ئەو ئەندامەی جەستەش کە خشڵەکەی پێوە دەکرێت حەرامە. ئیبن مەسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرمووێت زینەتی بەدەستهاتوو بریتییە لە "ئەو پۆشاکە جوان و سەرنجڕاکێشانەی کە ئافرەت لەبەریان دەکات"، زانای گەورەی تەفسیریش "موجاهید" دەڵێت بریتییە لە "بەرگ و گوارە و ملوانکە و سورمە و خەنە."[1] سەعیدی کوڕی جوبەیریش (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) پێی وایە کە دەست و دەموچاویش وەك ئەوانەی تر زینەتی کراوەن. ئیبن عەتییە لەم بارەیەوە دەڵێت "وەك من تێگەیشتبم ئایەتە پیرۆزەکە فەرمان بە ئافرەتان دەکات بە هەموو جۆرێك دووربکەونەوە لە دەرخستنی هەموو ئەو شتانە بۆ پیاوان کە پێیان دەوترێت

---

١. قرطبي، ٢٢٨/١٢.

زینەت. بەڵام کێشەیەك نابێت گەر لە کاتی پێویستیدا ئەندامەکانی وەك دەموچاو و دەستیان بکەنەوە."[1]

گەر پێویست بکات بەکورتی بیڵێین، مەبەست لە زینەتەکان یان شوێنی زینەتەکانی وەك ملوانکە و گوارە و بازنگە، یاخود خودی ئەو کەرەستە جوانکارییانە خۆیانە. ڕای یەکەم بەهێزترە. ئەو شوێنانەی کە بەریی کراون لە شوێنەکانی داپۆشین و جیاکراونەتەوە، دەست و، دەموچاو و قاچن. هەندێك زاناش هەن کە دەڵێن داپۆشینی دەموچاو و قاچ -بەتایبەت لە سەردەم و کاتەکانی بڵاوبوونەوەی فیتنەدا- فەرزە.

## ئەو کەسانەی کە مەحرەمی ئافرەتن

وەك لە ئایەتی ٣١ی سورەتی نوورەوە تێگەیشتین، ئەو کەسانەی کە ئافرەتی موسڵمان بێجگە لە نێوانی ئەژنۆ و ورگی و، سکی و، سنگی و، پشتی، دەتوانێت لە لایاندا ئەندامەکانی تری جەستەی دا نەپۆشێت، بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. مێردەکەی: ئافرەت دەتوانێت لە لای مێردەکەیدا بە هەر شێوازێك بیەوێت جلوبەرگ بپۆشێت. لە نێوان هاوسەرەکاندا سنوورێك بۆ بەرگپۆشین بوونی نییە. بەڵام لە ڕوانگەی ڕەوشتی گشتی و پارێزگاریکردن لە ڕێزی نێوانیانەوە، داپۆشینی شوێنی عەورەتیان جوان دەبێت.

٢. باوکی.

---

١. قرطبي ٢٢٩/١٢.

٣. خەزووری.

٤. کوڕی.

٥. کوڕی مێردەکەی.

٦. برای.

٧. کوڕی برای: برازا.

٨. کوڕی خوشکی: خوشکەزا.

٩. ئافرەتی موسڵمان: چونکە ئافرەتێکی موسڵمان، نابێت لە لای ئافرەتانی ژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا هاوشێوەی خزمە نزیکەکانی خۆی بە بەرگی کراوەوە دابنیشێت. لێرەدا ویستراوە ڕێ بگیرێت لەوەی ئافرەتانی ژێر دەسەڵاتی ئیسلام لە لای پیاوانی خۆیان وێنای ئافرەتی موسڵمان بکەن و بۆیان باس بکەن.

١٠. کۆیلە یاخود کەنیزەکەکەی: ئافرەت، دەتوانێت لە لای کۆیلە یاخود کەنیزەکەکەیدا دانەپۆشراو بێت، چونکە حەزرەتی پێغەمبەر (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) کۆیلەیەکی دابووە حەزرەتی فاتیمە. لەم کاتەدا حەزرەتی فاتیمە بەرگێکی وەهای لەبەردابوو، گەر سەری داپۆشیبا قاچی و گەر قاچیشی داپۆشیبا سەری دەردەکەوت. کاتێك پێغەمبەر ئەم دۆخەی بینی فەرمووی "کێشەیەك نابێت بۆ تۆ. چونکە ئەم لە شوێنی باوك و کوڕی تۆیە."[١]

١١. کەسانی وەك خزمەتکار و، باخەوان و چێشتلێنەر کە بەهۆی پیری و نەخۆشی و هۆکاری تری هاوشێوەوە ئارەزوویان بۆ ئافرەت نییە، یاخود لەبەر

---

١. أبو داود، اللباس ٣٢.

ئەوەی کە خزمەتکارن، زیانیان بۆ ئافرەتی خاوەنماڵ نابێت و بۆ ئافرەت وەك خزمەکانی تری وەهان.

١٢. ئەو منداڵە بچوکانەی کە لە شوێنە شاراوەکانی ئافرەت تێناگەن: لە لای ئەو منداڵانەدا کە لە تەمەنێکی وەها بچوکدان لە ڕووی شەهوەتەوە کاریگەر نابن بە قسە و هەڵسوکەوت و جلوبەرگی ئافرەتان، خۆداپۆشینی ئافرەت پێویست نییە. بەڵام گەر منداڵ نزیکبووبێتەوە لە چاخی باڵغبوون، ئیدی نابێت بچێتە لای ئافرەتە بێگانەکان، چونکە پێغەمبەری ئازیز فەرموویەتی "دوور بکەونەوە لە چوونە نێو ئافرەتان" لەسەر ئەمە یەکێك لە هاوەڵان فەرمووی "ئەی نێردراوی خوا! بۆ برای مێرد چی دەفەرموون؟" ئازیزمان لە وەڵامی ئەمەدا فەرمووی "شووبرا مەرگە!".[1]

فەرموودەیەکی پیرۆز

هاوەڵی بەڕێز "ئەبوزەڕ" (رضيَ اللهُ عَنْهُ) دەگێڕێتەوە. پێغەمبەری خوا فەرمووی:

"لە هەموو تەسبیحێکی وەك "سبحان اللّٰه" و لە هەموو سوپاسگوزارییەکی وەك "الحمد للّٰه" و لە هەموو تەکبیرێکی وەك "اللّٰه اکبر" و هەموو تەهلیلێکی وەك "لا اله الا اللّٰه" و هەموو بانگکردنێکی حەق و هەموو دوورکەوتنەوەیەك لە باتڵدا پاداشتی خێر (سەدەقە) هەیە. (تەنانەت) لە پەیوەندیی زایەندیی یەکێك لە ئێوە لەگەڵ هاوسەریدا پاداشتی خێر و چاکە هەیە."

---

١. الترمذي ١٦؛ أحمد بن حنبل ١٤٩/٤، ١٥٣.

حوکمەکانی تەماشاکردنی حەرام لە ئایینەکەماندا بریتین لە چی؟

هاوەڵە بەڕێزەکان (بە سەرسامی و مەراقەوە) پرسییان:

"ئەی نێردراوی خوا! یەکێك لە ئێمە کە ئارەزووی جەستەیی خۆی تێر دەکات چۆن پاداشتی چاکەی دەدرێتەوە؟"

- زۆر بەئاسایی پاداشتی دەدرێتەوە. ئەی گەر یەکێك لە ئێوە زینای کردبا، لەبەر ئەو زینایە نەدەچووە نێو گوناهەوە؟ بۆ ئەمە چی دەڵێن؟ هەر وەك ئەمە، کاتێك پەیوەندیی زایەندی لەگەڵ هاوسەرە حەڵاڵەکەی خۆیدا جێبەجێ دەکات پاداشتی دەدرێتەوە.[1]

## دوورکەوتنەوە لە ڕێگای حەرام

ڕەنگە مرۆڤ بە تەماشاکردنی حەرام بەرەو زینا هەنگاو هەڵ بنێت. لە ڕاستیدا خودی تەماشاکردن بە مانای خۆی، کردەوەیەکی موباحە. بەڵام گەر ئەو شتەی تەماشا دەکرێت خوای گەورە مۆڵەتی تەماشاکردنی نەدابێت، ئەو کات حەڵاڵنەبوونی ئەو تەماشاکردنە ڕوون و ئاشکرایە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕوانینە کۆمەڵێك ئەنجام بە دوای خۆیدا دەهێنێت کە کاریگەرییان لەپاشتردا دەردەکەوێت. ئەم ئەنجامانە پێکهاتوون لەو چەمکانەی کە حەرامبوونیان بەڕوونی لە قورئانی پیرۆزدا چەسپاوە. لەبەر ئەمە ئایینەکەمان وەك چۆن حەرامەکانی قەدەغەکردووە، وەك پرەنسیپێك ئەو ڕێیانەشی قەدەغەکردووە کە دەمانبەنەوە سەر گوناه. لەبەر ئەمە بێجگە لە هۆکاری پێویستی و بێگوناهە ڕوانینی حەرام لە ڕوانگەی ئەم پرەنسیپەوە بە حەرام هەژمارکراوە.

---

١. التبريزي، مشكاة المصباح، رقم الحديث: ١٨٩٨؛ مسلم، الزكاة، ٥٢؛ أبو داود،تطوع ١٢، الأدب ١٦٠؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٦٨/٧.

بۆ نمونە، تەماشاكردنی حەرام گوناهە و هەموو گوناهێكیش خاڵێكی ڕەش لە دڵدا دێنێتە مەیدان. گەر دەستبەجێ نەسڕێتەوە، بەتەواوی لە دڵدا دەچەسپێت. گەر پاش ئەمەش لەكە لەدوای لەكە بە دوایدا بێت -خوا پەنامان بدات- ڕەنگە دڵ سەراپا ڕەش دابگەڕێت. گەر تەنها سەرنجی یەكێك لە ئەنجامەكانی بدەین، دەبینین ڕوانینی حەرام زیانێكی هێندە گەورە بە مرۆڤ دەگەیەنێت. كاتێكیش سەرنجی چێژوەرنەگرتن لە پەرستشەكان و سەرجەم ئەنجامەكانی تری هاوشێوەی ئەمە دەدەین، دەبینین حەرامبوونی ڕوانینی حەرام لە ڕوانگەی پرەنسیپی "دووركەوتنەوە لە ڕێگاكانی حەرام"یشەوە ڕوون و ئاشكرا دەردەكەوێت.

## ئایا تەماشاكردنی حەرام لە گوناهە گەورەكانە؟

تەماشاكردنی ئافرەتێكی بێگانە بەشەهوەتەوە بە هەموو شێوازێك گوناهە. بەڵام بەتایبەت لەو دۆخەدا كە دەرگا بە ڕووی فیتنەدا واڵا دەكات، سەر دەكێشێت بۆ گوناهی گەورە. یەكێك لە گرنگترین ئەو پێوەرانەی زانا گەورەكان بەكاریان هێناوە بۆ هەژماركردنی لە ڕیزی گوناهە گەورەكاندا بریتییە لە سەركێشانی ئەم ڕوانینە بۆ فیتنە و فەساد. زانایانی وەك هەیتەمی سەرەتابوونی ئەم فەرموودانەیان لەڕێی سەرچاوەكانیانەوە چەسپاندووە و دواتریش هەڵسەنگاندنی خۆیان بۆ ئەنجامداوە:

لە گێڕانەوەكانی بوخاری و موسلیم و ئەوانی تردا هاتووە كە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرموویەتی:

"نەوەكانی ئادەم نسیبیان لە زینادا نووسراوە (تەقدیركراوە). هیچ گومانی

تێدا نییە نەوەی ئادەم دەگاتە ئەم عاقیبەتەی كە بۆی نووسراوە. زینای چاو ڕوانینە (بەشەهوەتەوە بۆ ئەو ئافرەتانەی كە مەحرەمی نین). زینای گوێچكەكان گوێگرتنە (لەو قسانەی كە گوێلێگرتنیان حەرامكراوە). زینای زمان قسەكردنە (دەربارەی ئەو شتانەی كە وتنیان حەرامە). زینای دەست، دەستلێدانە (بەشەهوەتەوە لە جەستەی ئافرەتێكی بێگانە). زینای قاچیش هەنگاوهەڵنانە (بۆ ئەو شوێنانەی كە بۆ ڕۆیشتنیان قەدەغەیە). دڵیش خۆزگە و ئارەزووی زینای هەیە. كۆئەندامی زاووزێ، ئارەزووەكانی ئەم ئەندامە یان بەجێ دەهێنێت یانیش ڕەتیان دەكاتەوە."[1]

لە ڕیوایەتێكی تری صەحیحدا هاتووە ئازیزمان فەرموویەتی:

"چاوەكان زینا دەكەن، پێیەكان زینا دەكەن و كۆئەندامی زاووزێش زینا دەكات"[2]

دیسان لە ڕیوایەتێكی "تەبەڕانی"دا پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەم شێوەیەی فەرمووە:

"یان چاوەكانتان (لەبەرامبەر دیمەنە قەدەغەكراوەكاندا) دادەخەن و، شوێنە مەحرەمەكانتان دەپارێزن، یانیش خوای گەورە پشتتان تێ دەكات."[3]

لە ڕیوایەتی "ترمزی"دا پێغەمبەرمان دەفەرموێت:

"ئەی عەلی، لە بەهەشتدا خەزێنەیەك بۆ تۆ هەیە و تۆش لە هەموو لایەنێكەوە بۆی گونجاویت. لەپاش بەرچاوكەوتنی یەكەم و لەناكاو، بۆ دووەم

---

١. صحيح البخاري، كتاب الأستئذان، صحيح المسلم، ٣٠٤٧/٤.

٢. لە ڕیوایەتەكانی "ئەحمەد بن حەنبەل و بەززار و ئەبویەعلا"وە وەرگیراوە.

١. لە ڕیوایەتی تەبەڕانییەوە وەرگیراوە.

جار تەماشا مەکەرەوە. لە یەکەم ڕوویەڕوویوونەوە بەخشراویت، بەڵام لە وەستان و سەرنجدانی دووەم جار نابەخشرێیت"[1]. لە فەرموودەیەکدا کە "تەبەرانی و حاکم" ڕیوایەتیان کردووە پێغەمبەری خوا هەواڵی ئەوەی داوە کە خوای گەورە فەرموویەتی:

"سەرنجدانی (ئافرەتی بێگانە)، تیرێکە لە تیرە ژەهراوییەکانی ئیبلیس. ئەوەی لە ترسی من واز لە نەزەرکردن (لە ئافرەتە بێگانەکان) بهێنێت، ئیمانێکی وەهای دەدەمێ لە دڵیدا هەست بە چێژ و خۆشییەکەی بکات."

لە ڕیوایەتێکی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت:

"هەر موسڵمانێك گەر لە ئافرەتێکی (بێگانەی) ڕوانی و دواتر (لەبەر ترسی خوای گەورە) چاوەکانی لا ببات، خوای گەورە پەرستشێکی وەهای بە نسیب دەکات چێژەکەی لە دڵیدا هەست پێ بکات." بەیهەقی لەمەڕ ئەم ڕیوایەتە دەڵێت "گەر ڕیوایەتەکە ڕاست بێت، بێگومان مەبەستی پێغەمبەری ئازیز لەو کەسانەیە کە بێمەبەست چاویان بەر ئافرەتی بێگانە کەوتووە و دواتر دەستبەجێ چاویان لابردووە."

لە ڕیوایەتێکی ئیصبەهانیدا ئازیزمان وای فەرمووە:

"لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو چاوەکان دەگرین. بەڵام ئەو چاوانەی لە حەرام پارێزراون و، ئەوانەی لە ڕێگەی خوادا بێخەو بوون و، ئەوانەش کە گەر هێندەی سەری مێشوولەیەکیش بێت فرمێسکیان لە ترسی خوا ڕشتووە، ئەم گریانە نایانگرێتەوە."

---

١. لە ڕیوایەتی "ئەحمەد بن حەنبەل و ترمزی و ئەبوداوود"ەوە وەرگیراوە.

لە ڕیوایەتێکی صەحیحی تەبەرانیدا پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت:

"سێ کەس هەن کە (لە ڕۆژی قیامەتدا) چاوی ئەوان ئاگر نابینێت: ئەو چاوەی لە ڕێگەی خوادا بێخەو ماوەتەوە، ئەو چاوەی لە ترسی خوا گریاوە و، ئەو چاوەی پارێزراو بووە لەو شتانەی کە خوای گەورە تەماشاکردنیانی حەرامکردبوو."

دیسان لە ڕیوایەتێکی تری حاکمدا پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت:

"ئێوە بەڵێنم پێ بدەن لەسەر ئەنجامدانی شەش شت، با منیش ببمە کەفیلتان بۆ چوونەبەهەشت: کاتێك قسە دەکەن، ڕاست بڵێن، کە بەڵێنتان دا بەڵێنەکەتان بهێننە جێ، کاتێك شتێکتان بە ئەمانەت لە لا دانرا، پارێزگاریی لێ بکەن و وەك خۆی بیگێڕنەوە، پاکیزەییتان بپارێزن، چاوتان دابخەن و دەست بۆ حەرام مەبەن."[1]

لە ڕیوایەتی موسلیم و ئەوانی تردا هاتووە، جەریر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەڵێت:

پرسیاری بەرچاوکەوتنی لەناکاوم لە پێغەمبەری خوا کرد. ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی "یەکسەر چاوت لاببە."[2]

هەیتەمی کە ئەم فەرموودانەی تۆمارکردووە، ئاماژەی بەوە داوە کە دواتر و لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی فیتنەدا ڕەنگە زۆر شتی تریش کە مرۆڤ پەلکێشی شەهوەت دەکات، حەرام ببێت و لە گوناهە گەورەکان هەژمار بکرێت.

هەژمارکردنی ئەو شتانە لە گوناهە گەورەکان، بۆ داخستنی ئەو دەرگایانەیە کە بە ڕووی حەرامدا والابوون. لەبەر ئەوەی گەر لە کاتی

---

١. لە ڕیوایەتی "ئەحمەد بن حەنبەل و حاکم"ەوە وەرگیراوە.

٢. صحيح مسلم، ١٦٩٩/٣، سنن أبو داود، ٢،٢٤٦، أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٣/٥.

سەلامەتیدا تەماشاکردنی نامەحرەم ڕێپێدراویش بێت دواجار ئەنجامی ئەمە ئەگەری سەرکێشانی هەیە بۆ بەدڕەوشتی و فەساد، ئەوەی لەگەڵ جوانییەکانی ئایینیدا یەک دەگرێتەوە، خۆپاراستنە لە وردەکاریی درێژخایەن و نەهێشتنی هەموو ئەو شتانەی مەترسی ئەوەیان هەیە ببنە هۆکار بۆ فیتنە.

بەڵێ، ئەوانەی لە ڕێی شیر و نەسەبەوە خزمایەتی و نزیکی لەنێوانیاندا هەیە، دەتوانن پێکەوە بن و ئافرەتان بێجگە لە شوێنە مەحرەمە دیاریکراوەکانیان، ئەندامەکانی وەک دەست و، قاچ و، دەموچاویان بەدەرەوە بێت. چونکە مەترسیی خراپ لە ئارادا نابێت. لە هەمان کاتدا پێویستە ئافرەتی خاوەن پاکیزەیی خۆی لە کەسانی خراپ و فاسق بپارێزێت. پێویستە لەم جۆرە کەسانە بەدوور بێت تا لە فێڵ و تەڵەکە و داوەکانیان پارێزراو بێت. ئافرەت لەو کاتانەدا کە پێویستە خۆی دەربخات وەک کاتی نەخۆشی و شایەتیدان، ئەو شوێنەی کە پێویستە دەیکاتەوە و تەماشاکردنی تەنها ئەو شوێنەی ڕێپێدراو دەبێت.

لە ڕیوایەتێکی صەحیحدا هاتووە کە "زینای چاو نەزەرە و، زینای زمان قسەکردنە و، زینای دەست دەستلێدانە و، زینای قاچ ڕۆیشتنە و، زینای نەفسیش ئارەزووکردنی ئەوە و مەیلی ئەو ئاڕاستەیەیە." لەبەر ئەمەیە کە مرۆڤە چاکەکان لەبەر مەترسیی زینا تا دواڕادە خۆیان بەدوورگرتووە لە نامەحرەمی ڕەگەزی بەرامبەر و تەماشاکردن و چوونە ناویان و دانیشتن و گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا. بە هەمان شێوە حەسەنی کوڕی زەکوان وتوویەتی: "زۆر هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵی دەوڵەمەنداندا مەکەن. چونکە ئەوان بۆن و سەرنجڕاکێشییەکی هاوشێوەی پاکیزەکانیان هەیە. تەنانەت فیتنەی ئەوان لە هی ئافرەت خراپترە."

یەکێك لە تابیعین فەرموویەتی "با پیاوێك پێکەوە لەگەڵ کوڕێکدا لە هەمان ژووردا نەخەوێت کە مەترسیی ئەوەی هەبێت بەرەو حەرام ڕای بکێشێت. من بۆ گەنجێکی خواناس، زیاتر لە ئاژەڵێکی دڕندە، لەوە دەترسم لەگەڵ منداڵێکی وەهادا بمێنێتەوە."

بە پێوەری ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەر (صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) پێکەوەمانەوەی پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا قەدەغە دەکات، هەندێك لە خواناسان مانەوەی پیاوان لەگەڵ ئەم منداڵانەدا بەتەنیا لە ژوورێك یان دوکانێك یاخود لە حەمامدا قەدەغە دەکەن. لەبەر ئەوەی پێغەمبەرمان دەفەرمووێت:

"هەرکاتێك پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا بەتەنها مایەوە، سێیەمیان شەیتانە." لە دۆخەکانی پیدۆفیلی و هاوڕەگەزبازیدا، ئەو فیتنەیەی لەبەرامبەر ئەو جوانییەدا دروست دەبێت، لەو فیتنەیە گەورەترە کە لەبەرامبەر جوانیی ئافرەتدا بەخەبەر دێت. لەبەر ئەوەی ئەو گومانەی کە لەو پێکەوەبوونەدا دەخرێتە مەیدان، لە گومانی پێکەوەبوون لەگەڵ ئافرەت بەهێزترە، حەرامبوونی ئەمەش ڕوونبووەتەوە و چەسپاوە.

لەمەڕ ئەم جۆرە فیتنانە، ئامۆژگاریی پێشینان لەڕادەبەدەرە. ئەوان وەك پیسی تەماشای ئەمەیان کردووە و ناویان بردووە. لێرەدا جیاکارییەکیان لەنێوان باشەکان و خراپەکاندا نەکردووە. تەنانەت جارێکیان سوفیانی سەوری دەچێتە حەمام دەبینێت منداڵێکی وەهاش لەوەدایە بێتە نێو حەمامەکەوە، دەڵێت "ئەمە دوور بخەنەوە، گەر لەگەڵ هەر ئافرەتێکدا شەیتانێك هەبێت، لەگەڵ ئەم جۆرە منداڵانەدا دە شەیتان هەیە."

کابرایەك بە منداڵێکی کەشخەوە دێتە خزمەت ئیمام ئەحمەد. ئیمام ئەحمەد دەپرسێت:

"ئەم منداڵە چیی تۆیە؟"، کابرا:

"منداڵی خوشکەکەمە"، پاشان ئیمام ئەحمەد فەرمووی:

"جارێکی تر مەیهێنە بۆ لای من، تۆش بۆ ئەوەی خەڵکی دەربارەی خۆت نەخەیتە نێو گومانەوە، بەتەنها لەسەر شەقامەکان لەگەڵیدا مەگەڕێ."

گەر سەنەدێکی لاوازیشی هەبێت، ئەم ڕیوایەتە ماهیەتی پشتڕاستکردنەوەی ڕیوایەتەکانی تری هەیە: کاتێك کاروانەکەی عەبدولقەیس گەیشت بە پێغەمبەر (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەنێویاندا گەنجێکی سەرنجڕاکێش و جوانیش هەبوو. پێغەمبەری خوا ئەم گەنجەی لە بەشی پشتەوە دانیشاند و فەرمووی "فیتنەی داود، لە ڕوانینی چاوەکانەوە سەری هەڵداوە."

## ئاهەنگی زەینەبی دایکمان

مەراسیمی ئاهەنگی زەینەبی دایکمان (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا)، بووە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکانی داپۆشین.

بانگهێشتکراوەکان لەپاش نانخواردن هەستان ڕۆیشتن. سێ کەس مابوونەوە، ئەوانیش دانیشتبوون چەنەبازییان دەکرد. خۆری هەردوو جیهان بۆ ئەوەی ئەوان هەستن و بڕۆن، دەچووە ژوورەوە و دەهاتە دەرەوە. بەڵام ئەوان لەم هەڵسوکەوتە حاڵی نەدەبوون. نازیزمان (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یەك یەك بەسەر ژووری دایکانماندا گەڕا و هاتەوە بەڵام بینی ئەوان هێشتا هەر قسە دەکەن. لەسەر ئەم ڕووداوە بێزارکەرە، خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴾ (الأحزاب: ٥٣)

"ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەكانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێت بۆ نانخواردنێك بێئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بكەن بەڵام ئەگەر بانگ كران، ئەوسا بڕۆنە ژوورەوە ئنجا ئەگەر خواردنەكەتان خوارد بڵاوەی لێ بكەن وە مەمێننەوە بۆ قسەكردن چونكە بەڕاستی ئەو (مانەوەیەتان) ئازاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەدات ئەویش شەرم دەكات لێتان، بەڵام خوا لە (وتنی) حەق شەرم ناكات وە هەر كاتێ داوای شتێكی ناو ماڵتان كرد لە (هاوسەرەكانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)) ئەوە لە پشتی پەردەوە لێیان داواكەن ئەو (شێوەداواكردنە) تان خاوێنترە بۆ دڵی ئێوە و ئەوانیش بە هیچ شێوەیەك بۆ ئێوە دروست نییە ئازاری (دڵی) پێغەمبەری خوا بدەن وە هەرگیز نابێت خێزانەكانی پاش خۆی مارە بكەن بەڕاستی ئەوە بە لای خواوە (گوناهێكی) زۆر گەورەیە."

لەو ڕۆژەوە خێزانەكانی پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و دایكانی ئیمانداران، چوونە پشت پەردەوە. بوونە سەرمەشق بۆ سەرجەم ئەو خانمە بەڕێزانەی ئیسلام كە تا قیامەت دێن. بەم شێوازە پارێزگارییان لە شەرەف و شكۆی مرۆڤایەتی كرد. ژیانێكی پاراو و ناوێتەی گەوهەری

عیففەت ژیان. چاو و دڵەکان لەگەڵ ئەم جوانییانەی ئیسلامدا کامەرانی و ئارامییان دەستکەوت. گرۆی مرۆڤایەتی لەگەڵ ئەم سەنگانەدا دڵشادبوو. تەنها بەم شێوازە توانرا بەهای مرۆڤ بزانرێت. مرۆڤ گەیشت بە شەرەفی مرۆڤایەتییەکەی.

## ئەو شوێنانەی عەورەت کە تەماشاکردنیان قەدەغەیە

شوێنەکانی عەورەت لە چوار بەش پێکهاتوون:

### آ. عەورەتی پیاو بەرامبەر بە پیاو

پیاو دەتوانێت بێجگە لە نێوانی ئەژنۆ و ورگ، هەموو بەشەکانی تری جەستەی پیاوێکی تر ببینێت. بەگوێرەی ئیمامی ئەعزەم ئەژنۆش عەورەتە.

### نوستن لە هەمان پێخەفدا

گەر هەر یەکەیان لە لایەکی جێگەکەشدا بن، رێپێدراو نییە دوو پیاو لە هەمان جێگەدا بخەون. پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت "با کوڕ و کوڕ لە نێو هەمان پێخەفدا باوەش بەیەکدیدا نەکەن. ئافرەت و ئافرەتیش لە نێو هەمان پێخەفدا باوەش بەیەکدیدا نەکەن."[1]

---

١. مسلم، أبو داود، الترمذي والنسائي نقلا عن أبو سيد الخدري.

## تەوقەکردن

باوەشبەیەکداکردن و ماچماچێن -بێجگە لە دەربڕینی شەفەقەتی کەسێك بۆ کوڕەکەی- مەکروهە. تەوقەکردنیش موستەحەبە (واتە کردنی خێر و چاکەیە و نەکردنیشی گوناە نابێت). لە سەردەمی بەختەوەریدا کابرایەك لە ئازیزمانی پرسی:

- ئەی نێردراوی خوا! ئایا گەر کەسێك لە ئێمە برایەکی یان دۆستێکی بینی دەتوانێت بۆی بچەمێتەوە؟

ئازیزمان (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) لە وەڵامدا فەرمووی:

- نەخێر.

کابرا:

- ئایا دەتوانێت باوەشی پێدا بکات و ماچی بکات؟

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) لە وەڵامدا فەرمووی:

- نەخێر.

کاتێك کابرا پرسی:

- ئایا دەتوانێت دەستی بگرێت و تەوقەی لەگەڵدا بکات؟

ئازیزمان لە وەڵامدا پێی فەرموو:

- بەڵێ.

## ب. عەورەتی ئافرەت بەرامبەر بە ئافرەت:

عەورەتی ئافرەت بەرامبەر ئافرەت وەك عەورەتی پیاو بەرامبەر پیاوە. ئافرەت دەتوانێت بێجگە لە نێوانی ورگ و ئەژنۆ، ئەندامەکانی تری جەستەی ئافرەتێکی تر ببینێت. بەڵام لە دۆخی مەترسیی فیتنەدا ئەم بینینە ڕێپێدراو نابێت. ئەو شوێنانەی کە پێویست دەکات ئافرەتی موسڵمان لە بەرامبەر ئافرەتانی ژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا دایان بپۆشێت ڕای جیاوازی لەسەرە. ئیبن عەبباس (رضي الله عنه) دەڵێت "حەرامە بۆ ئافرەتانی موسڵمان کە جەستەیان نیشانی ئافرەتی جولەکە یان مەسیحی بدەن. لەبەر ئەوەی ئەوان دواتر دەچن باسی جەستەی ئافرەتانی موسڵمان بۆ مێرد و کوڕەکانیان دەگێڕنەوە." حەزرەتی عومەریش (رضي الله عنه) لەو نامەیەدا کە بۆ والیی شام ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح (رضي الله عنه) نووسیبووی فەرموویەتی "بەپێی ئەو هەواڵانەی پێم گەیشتوون گوایە ئافرەتانی موسڵمان لەگەڵ ئافرەتانی ژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا لە هەمان حەمامدا خۆیان دەشۆن. ڕێگا بەمە مەدە. چونکە ڕێپێدراو نییە ئافرەتێکی ژێر دەسەڵاتی ئیسلام ئافرەتی موسڵمان بەبێ بەرگ ببینێت."[1] لەم بابەتەدا ئاماژە بەوە دراوە، ئەو ئافرەتانەی بەشێك نین لەوانەی کە ئایەتە پیرۆزەکە بە "ئافرەتانی خۆیان" ناوی بردوون، ئافرەتی نەناسراون و خوو و عادەتیشیان نازانرێت. دیارە لێرەدا مەبەست لە جیاوازیی ئایین نییە. بەم شێوەیە کێشە نابێت گەر ئافرەتی موسڵمان جوانییەکانی خۆی لەبەردەم ئافرەتێکی مەسیحی خاوەن عیففەت و بەناموسی ڕەوشتبەرزدا دەر بخات کە دەیناسێت. بەڵام گەر لەبەردەم ئافرەتانێکدا بێت کە پەردەی حەیایان لابردووە و متمانە بە ڕەوشت و پەروەردەیان ناکرێت و بێباکانە لەبەرامبەر

---

١. إبن كثير، مختصر التفسير ٢/٦٠٠-٦٠١.

پیاوانی بێگانەدا مامەڵە دەکەن (تەنانەت گەر موسڵمانیش بن)، پێویست و فەرزە لەسەر ئافرەتی موسڵمان کە جوانییەکانی خۆی لەبەرامبەر ئەم جۆرە ئافرەتانەدا دا بپۆشێت. چونکە زیانی ئەم جۆرە ئافرەتانە لە زیانی پیاوان کەمتر نییە.

## ج. عەورەتی ئافرەت بەرامبەر بە پیاو

گەر ئافرەت نامەحرەم (بێگانە) بێت، هەموو جەستەی عەورەتە. لە مامەڵە و پێویستیی وەك کڕین و فرۆشتندا، پیاو ڕێی پێدراوە کە تەنها تەماشای دەموچاو و دەستەکانی ئافرەت بکات. گەر هیچ هۆکارێك لە ئارادا نەبێت، ڕێپێدراو نییە پیاو بە ویستی خۆی تەماشای دەموچاوی ئافرەتی بێگانە بکات.

گەر هاتوو پیاو لەناکاو چاوی چووە سەر ئافرەت بە پابەندبوون بەم ئایەتە پیرۆزەوە، چاوەکانی لا دەبات "بە ئیمانداران بڵێ، چاوەکانیان (لەبەرامبەر حەرامدا) دابخەن."

ئیمامی ئەعزەم گەر دۆخێکی فیتنە لە ئارادا نەبێت، یەك جار ڕوانینی بە ڕێپێدراو زانیوە. بەڵام ڕوانینی چەند جارە ڕێپێدراو نییە. چونکە ئازیزمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە حەزرەتی عەلی فەرموو "ئەی عەلی! لەپاش یەك ڕوانین دووبارە مەڕوانە. چونکە لە یەکەم ڕوانین بەخشراویت، بەڵام لە دووەم ڕوانین نەبەخشراویت."

## د. عەورەتی پیاو بەرامبەر بە ئافرەت:

گەر پیاو بێگانە بوو بە ئافرەت، ئەو کات عەورەتی ئەو پیاوە بۆ ئەو ژنە نێوانی ورگ و ئەژنۆکانییەتی. بەپێی بۆچوونێکی تر، بێجگە لە دەموچاو و دەستەکانی، هەموو بەشەکانی تری جەستەی پیاو بەرامبەر ئافرەت عەورەتە. جەستەی ئافرەت هەر خۆی عەورەتە. چونکە نوێژکردنی ئافرەت بە جەستەی کراوەوە کارێکی دروست نییە. بەڵام جەستەی پیاو وا نییە. لە دۆخێکدا ئەگەری ئەوە هەبێت ئافرەت بکەوێتە نێو فیتنەوە، گەر بە ویست و مەبەست تەماشای پیاو بکات یاخود چەندجارە سەرنجی دەموچاوی بدات بە پشتبەستن بەم فەرموودە پیرۆزە، ڕێپێدراو نییە ''ئێوە هەردووکتان "سەرەڕای نابینابوونی" خۆتان لە ئیبن ئوم مەکتوم داپۆشن ''.

ئافرەت دەتوانێت تەماشای هەموو جەستەی مێردی خۆی بکات. بەڵام وەك ئەوەی کە ڕوانینی پیاو بۆ شەرمگەی خێزانی مەکروهە، ڕوانینی ئافرەتیش بۆ کۆئەندامی زاووزێی مێردەکەی مەکروهە. لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار فەرموویەتی ''ڕێپێدراو نییە پیاو لە ماڵدا بەبێ بەرگ و بەڕووتی دابنیشێت، پێویستە عەورەتی داپۆشێت.'' چونکە کاتێك ئەم دۆخەیان لە ئازیزمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پرسی، فەرمووی ''خوای گەورە لەپێشترە بۆ ئەوەی مرۆڤ شەرمی لێ بکات.''[1]

لە فەرموودەیەکدا کە لە ئیبن عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ڕیوایەتکراوە پێغەمبەرمان دەفەرمووێت ''ئاگاداری ڕووتی بن. چونکە بێجگە لە تەوالێت و دۆخی نزیکبوونەوەی پیاو لە خێزانەکەی، فریشتەگەلێك هەن لێتان جودا نابنەوە.''[2]

---

١. البخاري، الترمذي وأبن ماجه.

٢. الترمذي.

## هەندێک دۆخی تایبەتی

پیاو لە ژیانی کاردا بێت یاخود لە هەندێك پێویستیدا، دەتوانێت لەو ئافرەتانە بڕوانێت کە بێگانەن بە خۆی. لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد، خاوەنی تەفسیری گەورە، فەخرەدینی ڕازی، بەم شێوازە پۆلێنی ئەو پێویستییانەمان بۆ دەکات: ڕێپێدراوە لە دادگادا دادوەر یاخود شایەتەکان بە مەبەستی ناسینەوەی لە ئافرەت بڕوانن. چونکە لێرەدا تێپەڕاندنی ناحەقییەك و بەدیهێنانی حەق لە ئارادایە.[1]

لە کاتی کڕین و فرۆشتن و مامەڵەشدا ڕێپێدراوە بە مەبەستی ناسینی، تەماشای ئافرەت بکرێت. لە کاتی شایەتیشدا تەماشاکردنی ڕووی ئافرەت ڕێپێدراوە. چونکە ناسینەوەی کەسەکە تەنها بەم جۆرە دەبێت. هەرچی ڕوانینی شەهوەتئامێزیشە قەدەغەکراوە. ئەم فەرموودەیەش ڕاستیی ئەمەمان بۆ دیاری دەکات ''چاوانیش زینا دەکەن.''[2]

لە "فتاوي الهندية"دا ئەم دەستەواژەیە بەدی دەکرێت ''گەر مەترسیی فیتنە و شەهوەت لە ئارادا نەبوو، تەماشاکردنی دەست و ڕووی ئافرەت موباحە.''[3]

دیسان لە کتێبێکی تردا بەناوی "لمهذب"، هاتووە دەڵێت ''لە کاتی پێویستیدا بازرگانێك دەتوانێت لە ڕوخساری ئافرەت بڕوانێت. گەر نیەتێکی خراپ لە ئارادا نەبێت لە لای خوای پەروەردگار بەرپرسیار نابێت.''[4] ڕوانینی پیاو لە دەموچاو و دەستی خێزانە مردووەکەی، کێشەی تێدا نییە.

---

١. التفسير الكبير ٢٠٣/٢٣.

٢. أحمد والطبراني مسندا من أبن مسعود.

٣. الفتاوى الهندية ٣٢٩/٥.

٤. المهذّب ٣٤/٢.

## ئەو دیمەنانەی كە دێنە نێو خەیاڵمان

ئێمەی مرۆڤ بەرپرسیار نین لەو دیمەنانەی كە بەبێ ویستی خۆمان دێنە نێو بیر و خەیاڵمانەوە. بەڵام بەقەستی ئەنجامدانی ئەمانە ڕەنگە بەرەو خراپەی تر هەنگاومان پێ هەڵبنێن یاخود زیان بە حاڵەتی ڕۆحیمان بگەیەنن. بەڵام پڕكردنی خەیاڵمان بە ویست و ئارەزووی خۆمان لەم جۆرە فانتازیایانە، واتای وایە نیعمەتی خەیاڵمان لە شوێنی هەڵەدا بەكارهێناوە.

## تەماشاكردنی ئافرەتی باڵاپۆش

لەبەر ئەوەی دەست و دەموچاوی ئافرەت عەورەت نین، تەماشاكردنیان حەرام نییە. بەڵام كاتێك بەشەهوەتەوە تەماشا دەكرێت ئەو كات دەبێتە حەرام و، ئەو كەسەی تەماشای كردووە حەرامی ئەنجامداوە. تەماشاكردنی ڕووی ئافرەت گەر لەبەر پێویستیی كار یاخود سەردان بێت، حەرام نییە.

## قژی ئافرەت

قژی ئافرەت عەورەتە. لەبەر ئەمە تەماشاكردنی قژی ئافرەت حەرامە.

## تەماشاكردنی ئەوانەی كە دەیانەوێت هاوسەرگیری بكەن

* ئەو كەسانەی بە نیەتی هاوسەرگیری دەیانەوێت یەكتری ببینن، لەنێو هەندێك مەرجی دیاریكراودا دەتوانن لەیەكتر بڕوانن. بینینی یەكتر لە ڕوانگەی هاوئاهەنگیی نێوانیانەوە شتێكی باش دەبێت.[1] گرنگترین مەرج

١. النسائي، النكاح ١٧.

لەمەدا ئەوەیە لەگەڵ ئەو کەسەدا بەتەنها نەمێننەوە.[1] هەربۆیە ئەو لایەنانەی کە بە مەبەستی هاوسەرگیری یەکتر دەبینن پێویست و مەرجە کەسی سێیەم لەگەڵیاندا ئامادە بێت. بەپێچەوانەوە مانەوەیان پێکەوە و بەتەنها کە بە "خەڵوەت" ناو دەبرێت، کارێکی گونجاو نابێت. دەکرێت ئەم دیدارە قسەکردن و گفتوگۆ و، خستنەسەرزاری ویست و داواکاریی هەردوولا لە خۆ بگرێت. چونکە چ کێشەی زمان و زمانگرتن، چ تۆنی دەنگ، چ ئاستی بیرکردنەوە و ڕۆشنبیریی لایەنەکان، تا قسە بکەن زیاتر بەدەر دەکەوێت. ئەو کوڕەی دەیەوێت هاوسەرگیری بکات، پێش ئەوەی ببێتە داواکار و بەبێ ئەوەی کچەکە خۆی هەستی پێ بکات پێویستە تەماشای بکات. نابێت کچەکە و خێزانی کچەکە هەواڵیان لەمە هەبێت. مامەڵەکردن بەم جۆرە لە ڕوانگەی شەرەفی کچەکە و خێزانەکەیەوە گونجاوترە و، بەم شێوازە ڕێگا نادات نارەحەتییەکی دەروونی دروست ببێت. ئەگەر کچەکەی بەدڵ بوو دەبێتە داواکاری، بەم شێوەیە نە کچەکە، نە خێزانەکەی ئازاریان نادرێت. ئەم شێوازەش گونجاوترینە و بە ئەزموون سەلماوە. ئیزنی کچەکە هەبێت یان نا، ئەو فەرمودە پیرۆزانەی کە ئاماژەیان بە ڕێپێدراوبوونی ڕوانین کردووە، پشتگیریی ئەم شێوازە دەکەن.[2] تا مارەکردن و لە یەکتربینینەکانی دواتردا، وەك هەر ئافرەتێکی تری بێگانە دەتوانێت تەماشای بکات بە مەرجێك بە هەستی شەهەوییەوە نەبێت.

* پیاو دەتوانێت تەماشای دەست و دەموچاوی ئەو ئافرەتە بکات کە نیەتی هاوسەرگیری لەگەڵدا هەیە. جارێکیان ئەبو هورەیرە لای پێغەمبەرمان دەبێت کاتێك کەسێك دێتە خزمەت ئازیزمان و پێی دەڵێت کە دەیەوێت لەگەڵ

---

۱. بخاري، النكاح ۱۱۱.

۲. وهبة الزحيلي، معجم الفقه الاسلامي ۲٤/۹.

یەکێك لە ئافرەتانی ئەنساردا هاوسەرگیری بکات. ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) پێی دەفەرمووێت "تەماشای ئەو ئافرەتەت کرد؟" ئەو زاتەش لە وەڵامدا دەڵێت "نەخێر" پاشان پێغەمبەر دەفەرمووێت "مادام برۆ تەماشای بکە، چونکە شتێك لە چاوانی ئەنساردایە."[١]

* بەپوختی، وەك چۆن کوڕ کاتێك دەبێتە داواکاری ئافرەتێك بۆ هاوسەرگیری، دەتوانێت تەماشای بکات، لەو ماوەیەدا کە نیەتی هاوسەرگیرییەکە بەردەوامە، بەبێ ئەوەی زیادەڕەوی تێدا بکات، دەتوانێت دواتریش جاری تر تەماشای بکات. بە مەرجێك پێش مارەکردنیان لە خەڵوەتدا نەمێننەوە و ئاگایان لە مەرجەکانی داپۆشین هەبێت.

## دوو فەرموودەی پیرۆز

لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە (رضيَ اللهُ عَنْهُ) ڕیوایەتکراوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) فەرمووی "دوور بکەونەوە لە چاوەڕێکردن و دانیشتن لەسەر ڕێگاکان". لەسەر ئەمە ئێمە وتمان "ئەی نێردراوی خوا، بۆ باسکردن لە کارەکانمان لەسەر ڕێگاکاندا دەوەستین." پێغەمبەری خوا فەرمووی "مادام بەردەوام دەبن لە دانیشتن لەسەر ڕێگاکان، ئەو کات مافی ڕێگاکە بدەن" کاتێك پرسیمان "مافی ڕێگا چییە؟" پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) فەرمووی "پاراستنی چاوەکان و، ئازارنەدانی کەس و، وەڵامدانەوەی سڵاو و، فەرماندان بە چاکە و، دوورخستنەوەی مرۆڤەکانیش لە خراپە"[٢] بەپێی ڕیوایەتێکی ئەبو هورەیرە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:

---

١. مسلم، النكاح ٧٤.

٢. البخاري و مسلم.

"ئەوەی ئادەم پشکی لە زینادا دیاریکراوە. ئەو بێگومان بەمە دەگات. زینای چاو ڕوانینە، زینای گوێچکەکان گوێگرتنە و، زینای زمان قسەکردنە و، زینای دەست دەستلێدانە و، زینای قاچیش ڕۆیشتنە. دڵیش ئارەزوو دەکات و، ویستی دەبێت. ئەندامی زاووزێش ئەمە یان بەرجەستە دەکات، یانیش ڕەتی دەکاتەوە."[1]

## ئایا لە ئیسلامدا چەند جۆر ڕوانین هەیە؟

دەکرێت ڕوانینەکان بەپێی قەدەغەبوون یان قەدەغەنەبوونیان لە ڕوانگەی ئاییینەکەمانەوە بۆ چوار جۆر ڕوانین پۆلێن بکەین.

### ڕوانینی مەندوب

* ئەمە ڕوانینێکە کە پشتگیری لێ دەکرێت و ئەو تایبەتمەندییانە لەخۆ دەگرێت کە بەکارهێنانی نیعمەتی چاو داخوازیەتی. واتە نیعمەتی چاو کە خوای گەورە بە ئێمەی بەندەی بەخشیوە دەبێت لەم بوارانەدا بەکاری بهێنین. ئەمەش دەکرێت بە دوو بەشەوە: دیار و نادیار... دەکرێت ئەمانەش بەم شێوازە ڕیز بکەین:

* تێفکرین بە بەسیرەت و وردییەوە لەپێناو پەندوەرگرتندا و، ڕوانین لە دیوی ناوەوەی بوونەوەر کە نیشاندەری هونەری خوای پەروەردگارە. دەکرێت بەم ڕوانینە لە ڕێگەی چاوێکی دیار و بەرجەستەوە لە دەرگای نهێنییە شاراوەکان بدەین. ئەم ڕوانینە بەرەو ناسینی خوای گەورە دەمانبات کە هەموو شتێکی بە ڕێکوپێکییەکی دەراسا بەدیهێناوە. چونکە هەموو گەردوون

---

١. البخاري، الأستأذان ١٢، القدر ٩، مسلم، القدر ٢٠-٢١، أبو داود، النكاح ٤٣.

لێوانلێوە لەو وشە و نهێنییانەی کە باس لە خوای پەروەردگار دەکەن.

چەند جوان وتوویەتی:

بیر لە نهێنییەکانی گەردوون بکەوە و تێیان بفکرە،

چونکە هەریەك لەوان نامەیەکی پەروەردگاری جەلیلە.

* تەماشاکردنی ڕوخساری کەسانی زانا و، پیاوچاك و خاوەن فەزیلەتیش سەر بەم جۆرە ڕوانینەیە. گەر فەرموودەکە لاوازیش بێت، ڕیوایەتکراوە کە ئازیزمان فەرموویەتی "تەماشاکردنی ڕوخساری کەسی زانا، پەرستشە"[1] لەبەر ئەمە هاوەڵە بەڕێزەکان چاوەکانیان لەسەر ڕووی ئازیزمان لا نەبردووە.

* تەماشاکردنی لاپەڕەکانی قورئانی پیرۆزیش لەم جۆرە ڕوانینە هەژمار دەکرێت. جارێکیان پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی "بەشی چاوەکانتان لە پەرستش بدەن." هاوەڵان پرسیاریان لە چۆنێتی ئەمە کردووە، ئازیزیشمان لە وەڵامدا فەرموویەتی "بریتییە لە تەماشاکردنی لاپەڕەکان و تێفکرین و پەندوەرگرتن لەو شتانەی باسی کردوون."[2] پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە لە پاڵ قورئانی پیرۆزدا تەماشاکردنی فەرموودەکان و تێفکرینیان و پەندوەرگرتن لێیان، لەژێر هەمان چەتردا دەبێت. لەم بابەتەدا ڕیوایەتکراوە کە دوو دەستنووس لەبەر ئەوەی حەزرەتی عوسمان (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) چەندین جار خوێندوونیەتەوە و ئەم زاتە بەردەوام لە قورئانی پیرۆزدا لە قووڵبوونەوە و تێفکریندا بووە، هەردووکیان دڕاون.

* تەماشاکردنی دەست و دەموچاوی ئەو ئافرەتەی کە دەتەوێت

---

١. أنس بن مالك، مسند، رقم الحديث ٦٨٦٧.

٢. أبو سيد الخدري، الديلمي، الفردوس، رقم الحديث، ٣٥٢؛ الغزالي، إحياء ٣٦٢/٤.

هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکەیت دیسان لەم جۆرە ڕوانینەیە. تەنانەت لە فەرموودەکاندا هانی ئەم ڕوانینە دراوە.[1] بێگومان مەرج ئەوەیە کە ئەم ڕوانینە لە خەڵوەتدا نەبێت. ڕەنگە پێویست بکات ئەم ڕوانینە دووبارە بکرێتەوە، بۆیە "سێ جار" وەك پێویستیبوونی سنوورێك بۆ ئەمە دانراوە.[2] بێجگە لە دەست و ڕوخسار، تەماشاکردنی بەشەکانی تری جەستەی، دەبێتە سنووربەزاندن و ئەمەش لە کتێبەکانی فیقهدا ڕوونکراوەتەوە.[3]

## ڕوانینی موباح

تەماشاکردنی هەموو شتانی تری موباحی بێجگە لە عەورەت، بە ڕوانینی موباح هەژمار دەکرێت. وەك تەماشاکردنی زێڕ و زیو و ئاوریشم و خواردن و نیعمەتەکان. مەرجیش بۆ ئەمە نەبوونی هەر جۆرە خراپەیەکە لەو شوێنەدا کە تەماشا دەکرێت. قاپە زێڕ و زیوینەکان، کەلوپەلی کەسە زاڵمەکان، بە جوان تەماشا نەکرێن بەڵکو بە نیەتی ئینکارەوە تەماشا بکرێن.[4]

ئەو شتانەی کە تەماشاکردنی ئافرەت لەبەر پێویستییەك موباح دەکەن بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. گرێبەستی مارەبڕین کە هاوسەرەکان دەتوانن تەماشای هەموو جەستەی یەکتر بکەن. دوو ڕا هەیە لەسەر مەکروهـ یان حەرامبوونی ڕوانینیان

---

١. الترمذي، النكاح ٣٩٧/٣؛ ابن ماجه، السنن ٦٩/٦؛ النسائي، السنن ٥٩٩/١؛ البيهقي، السنن الكبرى ٨٤/٧.

٢. ابن عابدين ٣٧٠/٦؛ المغني ٥٥٣/٦.

٣. ابن عابدين ٣٧٠/٦؛ المغني ٥٥٣/٦ ، التهانوي ٣٨٢/١٧.

٤. علي عطية بن حسن الهيتي، أحكام النظر ص. ٦٥-٦٦.

بۆ شوێنەکانی عەورەت. لەو فەرموودەیەدا کە باسی ئەمە دەکات، ئاماژە بەوە دەکرێت کە تەماشاکردنی شوێنی عەورەت دەبێتە مایەی کوێری (بە مانای نابینابوونی چاوی دڵ.) ئەو پیاوەی کە خێزانی وەفات دەکات، لەپاش مردنی ناتوانێت تەماشای بکات، ئیدی ئەو ئافرەتە دەچێتە دۆخی ئافرەتێکی بێگانەوە بۆ ئەو.[1] زانایانی حەنەفی ئەوە دەخەنە ڕوو کە مردن تەماشاکردن و دەستلێدان ناهێڵێت.[2]

٢. تا تافی باڵغبوون، بچوکیش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە تەماشاکردن دەکاتە موباح. بێجگە لە شەرم، جیاوازی نییە لەنێوان شوێنەکانی عەورەت و شوێنەکانی تریدا.

٣. ئەوانەی لە ڕێگەی نەسەب و شیر و خزمایەتییەوە مەحرەمن بە یەکتر، ڕوانینیان موباحە. لەم دۆخەشدا بێجگە لە نێوانی ورگ و سەرئەژنۆکان ڕوانین بە موباح هەژمار دەکرێت.

٤. تا ئەو کاتەی تێگەیشتنەکان بۆ ئایین و پاکیزەیی یەك بن، بێجگە لە نێوانی ورگ و سەرئەژنۆکان ڕوانینی هاوڕەگەزەکان بۆ یەکتر موباحە. ڕوانینی ئافرەتێکی کافر بۆ ئافرەتی موسڵمان یاخود ڕوانینی ئافرەتێکی فاسق بۆ ئافرەتێکی خاوەن عیففەت، موباح نییە.

٥. کۆیلەش بە مەرجێك بەشەهوەتەوە نەبێت، بێجگە لە نێوانی ورگ و سەرئەژنۆکان، ڕوانینی شوێنەکانی تر موباح دەکات. بەڵام زۆربەی زاناکان لە ڕوانگەی پرەنسیپی بەربەستدانان لەبەردەم ڕێگاکانی حەرامدا ئەم بابەتەیان هەڵسەنگاندووە هەربۆیە بە شێوازێکی نەرێنی لەمەیان ڕوانیوە.

---

١. امام النووي، مجموع ١٣٩/٣.

٢. كساني، بدائع الصنائع ٢/٣٣١.

٦. دۆخەکانی پێویستیش لەو تایبەتمەندییانەن کە ڕوانین دەکەنە موباح. یەکەمین پێوەر کە پێویست بێت بۆ ئەو دۆخانە دیاری بکرێت، بریتییە لەوەی پێویستییەکان بەگوێرەی ئاستی پێویستییان، ڕوانین دەکەنە موباح. با بەم شێوازە دۆخەکانی پێویستی و بوارەکانیان پۆلێن بکەین:

أ. پێشتر باسی حوکمی تەماشاکردنی کاتی هاوسەرگیریمان کرد.

ب. پێویستیی پەروەردە و فێرکردن. لەم دۆخەدا بە مەرجی سەلامەتبوون لە فیتنە، ڕوانین بۆ ڕوخسار موباح دەبێت. بۆ ئەمەش پێویستە بابەتەکە شتانی واجبی وەك نوێژ و دەستنوێژ و غوسڵ و حەیز بێت یانیش بابەتێکی زانستی کە فێرکار مامۆستای ئەو بوارە بێت. لەم بابەتەدا کەسانێك هەبوون دژی ئەم ڕایەی ئیمامی نەوەوی[1] وەستاونەتەوە و وتراوە کە دەتوانرێت لەپشتی پەردەشەوە ئەم بابەتانە فێر بکرێت.[2] ئاشکرایە کە دەبێت لە سەردەمی فیتنەدا باشتر ئاگاداری ئەم جۆرە شتانە ببین.

ج. کاتێك پزیشك چارەسەری نەخۆش دەکات پێویست دەکات بە مەبەستی پشکنین تەماشای ئەو شوێنە بکات کە پێویستی بە چارەسەرە. لەم دۆخەدا سەرەتا تەماشا دەکرێت تا بزانرێت ئایا خانمی پزیشك لەو بوارەدا هەیە یان نا. گەر هەبێت ئەوا خانمێکی پزیشك چارەسەرەکە جێبەجێ دەکات. گەر نەبێت پێویستییەکان بەپێی پێویست جێبەجێ دەکرێن، واتە بەپێی پێویستیی نەخۆشییەکە، چارەسەر لە لایەن پزیشکێکی دادگەرەوە جێبەجێ دەکرێت. گەر پزیشکێك هەبێت کە بە سیفەتی دادگەری ناسرابێت ئەو کات کارێکی

---

١. الشربيني، المغني المحتاج ١٣٤/٣.

٢. الشربيني، المغني المحتاج ١٣٤/٣، علي بن عطية بن حسن الهيتي، أحكام النظر، ص. ٨٨.

دروست نییە چارەسەر لە لایەن پزیشکێکی فاسقەوە ئەنجام بدرێت، یان گەر پزیشکێکی موسڵمان لەوێ بێت ئەو کات دروست نییە چارەسەر لە لایەن پزیشکێکی بێباوەڕە ئەنجام بدرێت.[1]

د. ڕوانینی پزیشکانی منداڵبوون بۆ داوێن و ناوچەی عەورەتی ئافرەت موباحە.

ح. ئەو کەسەی زیناکارانی بەرچاو دەکەوێت موباحە بۆی تەماشای شەرمگەیان بکات تا بتوانێت شایەتی بدات.

خ. ئەگەر پێویستییەك لە ئارادا بێت و، بۆ ئەوەی شایەتی بۆ لەدایکبوونەکە بکرێت، تەماشاکردنی داوێنی ئافرەت موباح دەبێت.

ه. ئەگەر پێویست بکات، بۆ شایەتیدان لەسەر شیردانی ئافرەت، تەماشاکردنی سنگی موباحە. لێرەشدا دڵنیایی نەبوونی فیتنە و هەنگاونەنان بەرەو گوناهـ مەرجێکی سەرەکییە.[2]

## ڕوانینی حەرام

گەر بە چاوی ئینکارەوە بۆ کردەوەیەکی خراپ نەڕوانرێت، ئەو ڕوانینە خاوەنەکەی گوناهبار دەکات. ڕوانین بە چاوی ئینکارەوە مانای ئەوەیە لە دڵەوە بوغز لەو کردەوە خراپە بکرێت و بە کردەوەیەکی ناشرین و پووچ تەماشا بکرێت.

---

١. علي بن عطية بن حسن الهيتي، أحكام النظر، ص. ٨٩.

٢. علي بن عطية بن حسن الهيتي، أحكام النظر، ص. ٩١.

یەکێك لە ڕوانینە حەرامەکان تەماشاکردنی هاوڕەگەزە بەشەهوەتەوە لە کاتی نەبوونی دڵنیایی فیتنەدا.

حەرامە کەسێك تەماشای شوێنەکانی عەورەت و قژ و تەنانەت نینۆکی ئەو ئافرەتانە بکات کە حەرام بێت هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکات.

ڕوانینە مەکروهەکانیش بریتیین لە، ڕوانینی ژن و مێرد بۆ عەورەتی یەکتر و تەماشاکردنی ئاسمان لە کاتی نوێژدا.[1]

## سنووری تەماشاکردن چییە؟

پێویستە پیاو لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا کە بێگانەیە بۆی و ئافرەتیش لەگەڵ ئەو پیاوەدا کە بێگانەیە بۆی، پابەندی سنوورەکانی پەیوەندیی نێوانیان بن.

باشە، سنوور و چییەتی ئەم ڕوانینە قەدەغەکراوە لە چیدایە؟ لە ئایەتە پیرۆزەکەدا مەبەست لە پاراستنی چاوەکان بەرامبەر بە حەرام، ئەوە نییە ئیدی چاوەکان دابخرێت و بە سەری نەوییەوە ڕێ بکرێت. ناکرێت مرۆڤ بەم شێوازە ڕەفتار بکات. مرۆڤێك بەسروشتی ئەو پیاوە یاخود ئافرەتە دەبینێت کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە و، تەماشای دەکات. بەڵام ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت باسی بکەین، تەماشاکردنی ڕەگەزی بەرامبەرە بە شەهوەت و خواستی جەستەییەوە. پێوەری تەماشاکردنی شەهوەتئامێزیش تەماشاکردنی بەردەوام و چەندجارەیە. ئەم تەرازوو و هاوسەنگییەش لە پێغەمبەری ئازیزمانەوە

---

١. الشربيني، المغني المحتاج، ٣/١٣٤.

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فێر دەبین. لەم بابەتەدا پێغەمبەری ئازیز (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە حەزرەتی عەلی فەرموو "ئەی عەلی، دوابەدوای یەك تەماشا مەکە! یەکەم ڕوانین قابیلی لێخۆشبوونە، بەڵام دووەم ڕوانین قابیلی لێخۆشبوون نییە."[1]

کاتێك ڕەگەزی بەرامبەر بەرچاوی مرۆڤ دەکەوێت، ئەوەی پێویستە مرۆڤ بیکات، لابردنی سەرنجە لەسەری. سەری وەربچەرخێنێت و، چاوی لا ببات و، گەر پێویستیش بکات ڕێگا و ئاڕاستەکەی بگۆڕێت. بەپێچەوانەوە تا بێت نزیك دەبێتەوە لە تەماشاکردنی شەهوەتئامێزی و چاوەکانی لا نابات و بەردەوام دەبێت لە تەماشاکردنی.

لە تەفسیری فەخرەدینی ڕازیدا، ئەم ڕستەیە لە تەوراتەوە هێنراوە "تەماشاکردنی حەرام تۆوی شەهوەت لە دڵدا دەچێنێت. هەموو شەهوەتێکیش خەمی قووڵ لە مرۆڤدا دێنێتە بوون."

هەر تۆوێکی گوناه کە دەکەوێتە نێو دڵ، گەر زەمینەی گونجاو دەست بخات و بچەسپێت، ژیانی مەعنەویی مرۆڤ دەخاتە مەترسییەوە. وەك ەزننونی میسری دەڵێت "داخستنی چاوەکان بە ڕووی گوناهدا، چاکترین ڕێگایە بۆ خۆپاراستن."

هەر دەربارەی ئەم بابەتە ئیبن قەییوم ئەمانە دەڵێت:

ڕوانینەکان پێشڕەو و نێردراوی شەهوەتن. خۆپاراستن لە تەماشاکردنی حەرام، بنچینەی پاراستنی شوێنی مەحرەمە. ئەو کەسەی سەربەستانە تەماشای چواردەوری دەکات، ئاشکرا خۆی دەخاتە سەر ڕێگا مەترسیدارەکان.

---

١. أبو داود، النكاح ٣؛ الترمذي، الأدب ٢٨.

ڕوانین لەڕاستیدا بناغەی ئەو ڕووداوانە دادەنێت کە دێن و خۆیان بە مرۆڤدا دەدەن. چونکە ڕوانین لە دڵدا هەست بنیات دەنێت، ئەم هەستە بیر دەهێنێتە مەیدان، دواتر بیر شەهوەت بەخەبەر دەهێنێت، شەهوەت بە دوای خۆیدا ئیرادە بەرهەم دەهێنێت، دواتر ئەمە بەهێز دەبێت و دواجار دەبێتە بڕیارێکی نەگۆڕ، لەپاشدا کردەوەکە بەرجەستە دەبێت. گەر بەربەستێك لەو نێوەندەدا نەیەتە ڕێ، سەرجەم ئەمانە ڕوو دەدەن. بۆیە وتراوە: "ئارامگرتن لەسەر پاراستنی چاوەکان لە حەرام، ئاسانترە لە ئارامگرتن لەسەر ئەو ئازارانەی کە لەپاش ڕوانینی حەرامەوە دروست دەبن."[١]

## گوناهی تەماشاکردنی فیلم و وێنە و ڤیدیۆی بەدڕەوشتی چییە؟

لە ئایەتی ٣٢ ی سورەتی(الإسراء)دا خوای گەورە دەفەرمووێت "لە زینا نزیك نەبنەوە!" ئەوەی لێرەدا دەبێت سەرنجی بدەین ئەوەیە کە نافەرمووێت، "زینا مەکەن"، بەڵکو دەفەرمووێت "لە زینا نزیك مەبنەوە." بەم شێوەیە لێرەوە بەڕوونی تێدەگەین کە هەموو ئەو وێنە و دیمەنانەی مرۆڤ بەرەو زینا دەبەن و هەستە شەهەوییەکانی دەکەنە ئامانج تەماشاکردنیان قەدەغەکراوە. لە لایەن زۆرێك لە زاناکانەوە ئاماژە بەوە کراوە کە تەماشاکردنی وێنە و دیمەنی بەدڕەوشتی لەنێو ئەو سنوورانەدایە کە لە ئایەتەکەدا باسکراون.

دەستپێکردنی تێکچوونی ڕەوشت لەگەڵ تەماشاکردنی ئەو دیمەنانەدا و، پەرەسەندنی لەگەڵ چەندبارەکردنەوەیدا و، دواتریش بوونی بە گوناهی

---

١. الجواب الكافي، ص. ١٢٩-١٣٠.

کرداری، ئەم ڕاستییەمان بەڕوونی بۆ دەردەخات. پێویستە ئەوەش بڵێین کە چاوەکان وێنەی ئەو دیمەنە دەگرن کە بینیویانە، پاشان لە مێشکدا تۆماری دەکەن و مێشکیش لە گەنجینەی خۆیدا دەیشارێتەوە. بە بزواندنێکی بچوکی شەیتان، ئەم وێنە و دیمەنانە دەتوانن بەئاسانی مرۆڤ بەرەو زینا بدەنە بەر.

پرسیاری دەربڕینی "بە پیاوانی ئیماندار بڵێ، چاوەکانیان لە حەرام بپارێزن. بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ، چاوانیان لە حەرام بپارێزن."[1] لە ئیمامی شیبلی کرا، ئەویش وتی "با چاوی سەریان لە حەرامەکان و چاوی دڵیشیان لە شتانی بێجگە لە خوا بپارێزن"[2]

بەڵێ، پێویستە چاوەکان لە تەماشاکردنی وێنە و دیمەنی بەدڕەوشتی بپارێزرێن تا خەیاڵەکان پاك و پاراو بن و زیهنیش لە پیسبوون بەدوور بێت. نابێت تەنها بە پاراستنی چاوی سەرەوە بوەستین، بەڵکو نابێت حەرام بهێنرێتە نێو خەیاڵیشەوە.

کاتێك ئەوە لەبەرچاو دەگرین کە زۆربەی تێکچوونی ڕەوشت بە نەزەری حەرام دەست پێ دەکات، ئەو کات تێدەگەین تەماشاکردنی وێنە و دیمەنی بەدڕەوشتی چەندە مەترسیدارە.

ئەم دۆخە هەموو خاوەنپیشەیەك لە پیشەکەی دوور دەخاتەوە و سەرنج و هیممەتی لەو شوێنە ناهێڵێت کە پێویستە. بۆ نمونە دەبێتە بەربەست لەبەردەم کۆششکردنی قوتابیدا، وا دەکات کارمەند کارەکەی خۆی پشتگوێ بخات، بیری پیاوی بیرمەندیش سەرقاڵ دەکات.

---

١. سورة النور ٢٤/٣٠،٣١.

٢. حمدي يازر، دين الحق، لغة القرآن، سورة النور ٢٤/٣٠.

وەك چۆن تەماشاکردنی ئەو وێنە و فیلمانە قەدەغەن کە لایەنی جەستەیی و شەهوەتی مرۆڤ دەبزوێنن، بە هەمان شێوە دەرکردنی ئەم جۆرە فیلم و وێنانە و، بڵاوکردنەوە و فرۆشتنیان لەو حەرامانەیە کە ئایینەکەمان قەدەغەی کردووە. ئەو دەزگا و ڕاگەیاندنانەی کە وەك دیاردەیەکی ئاسایی مامەڵە لەگەڵ کراوەیی و ڕووتیدا دەکەن و لە ڕێگەی هۆکارە بینراوەکانی پەیوەندییەوە بەردەوام ئەمە دەخەنە بەر چاوی مرۆڤەکان، بێگومان ئەمانە لەنێو تاوانێکی گەورەدان. ئەوانەی کە دیمەنی ورووژێنەری جەستەیان کردووەتە هۆکارێك بۆ کاری ڕیکلام و بازارسازی، لەنێو حەرامێکی خستتردان. فۆتۆمۆدێلەکانیش کە ڕووتییان کردووەتە پیشە، ڕوون و ئاشکرا لەنێو حەرامدان.

هەندێك ڕایان وایە تەماشاکردنی دیمەنی نێو ڕۆژنامە و گۆڤار و تەلەفزیۆنەکان کە بەختەوەریی خێزان دەشێوێنن و مرۆڤ بەرەو کرانەوەیەکی ئەخلاقی بەرچاو دەبەن و ئارەزووە شەهەوییەکان دەدەنە بەر قامچی، وەك تەماشاکردنی جەستەی ڕاستی نییە. بابەتێکی وەها کە فیتنە بەخەبەر دەهێنێت و کەس ناتوانێت بڵێت حەڵاڵە و، لەبەر مەترسیی سەرکێشانی بۆ حەرام، زۆر لەوە نزیکە پێی بوترێت حەرام و ئەگەری ئەوەشی هەیە ببێتە هۆکار بۆ زینای ڕاستەقینە، بۆیە بۆچوونێکی دروست دەبێت گەر حوکمی حەرامی پێ بدرێت.

لێرەدا ئاماژەدان بەم خاڵەش کارێکی بەسوود دەبێت. ڕووتی، نەك بەتەنها لە ئافرەت، بەڵکو ڕەنگە لە پیاویشەوە بێتە ئاراوە. دەرخستن و تەماشاکردنی ئەو ئەندامەی جەستە کە پێی دەوترێت عەورەت لە لایەن هەر کەسێکەوە بێت حەرامە و گوناهە. بەڵام حەرامی و گوناه تا لە مەحرەمترین خاڵەکان نزیك ببێتەوە زیاد دەکات و قورس دەبێت.

لێرەدا پێویست ناکات بچینە نێو ڕوونکردنەوەی جیاجیاوە. واتە چەندە هەڵسەنگاندنی جیاجیا دەربارەی ئاستی حەرامیی وێنە و فۆتۆ و ڤیدیۆکانیش ئەنجامدرابێت، عەقڵ خۆی لە هۆکاری حەرامیی ئەم بابەتە تێ دەگات. ئەویش بریتییە لە نزیککردنەوەی مرۆڤ لە زینای ڕاستەقینە. دەبینین خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) نەك ئەنجامدانی زیناکە خۆی بەڵکو نزیکبوونەوەشی قەدەغە کردووە. ئەم هۆکارە لە تەماشاکردنی وێنە ڕووتەکانیشدا هەیە. هەر لەبەر ئەوە پێویستە لەو ئاستەدا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

هۆکارەکانی وەك ڕاگەیاندن و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت، لە کاتێکدا پێویستە لە خزمەتکردنی مرۆڤایەتیدا ڕۆڵێکی باڵا ببینن، بە پێچەوانەوە زیاتر خراونەتە دۆخێکی زیانبەخشەوە. لەگەڵ ئەمەشدا لەبەر ئەوەی وێنە ڕووتەکانی نێو ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و دیمەنە کراوەکانی نێو تەلەفزیۆن، ڕاستی نین و وێنە و خەیاڵن، تەماشاکردنی ئەوانە وەك تەماشاکردنی جەستەی ئافرەتی ڕاستی بە حەرام هەژمار ناکرێت. بەڵام بۆ کەسێك بەشەهوەتەوە تەماشای بکات، حەرام دەبێت. نابێت ئەوەشمان لە یاد بچێت کە تەماشاکردنی ئەم جۆرە دیمەن و وێنانە زۆربەی جار بەدەر نین لە شەهوەت.

پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت:

"دوو پۆل هەن لە ئەهلی دۆزەخ کە ئەوانم نەبینی. (یەکێك لەوان) ئەوانەن کە بە قامچی هاوتای کلکی مانگا لە مرۆڤەکان دەدەن. دووەمیشیان، ئەو ئافرەتانەن کە بەرگیان پۆشیوە بەڵام ڕووتن، بە لوتبەرزییەوە بە ڕێدا دەڕۆن، زۆر لە ئافرەتانی تر دەکەن وەك خۆیان بن و، سەریان لە کۆپارەی وشتر دەچێت. ئەوانە ناچنە بەهەشتەوە، تەنانەت بۆنیشی ناکەن. لەکاتێکدا بۆنی بەهەشت لە ٥٠٠ ساڵ دوورییەوە هەستی پێ دەکرێت."[١]

١. مسلم، الجنة ٥٢.

زۆر میکرۆب و ڤایرۆس هەن کە ناویان لەگەڵ مردندا دەبرێت. کاریگەرترین ڕێگەی جەنگ لەگەڵ ئەم جۆرە میکرۆب و ڤایرۆسە کوشندانەدا، بێگومان ڕێگریکردنە لە هاتنەناوەوەیان بۆ ناو جەستەمان. تەنانەت لەپێناو پاراستنی تەندروستیماندا، گرنگترین بنچینە بریتییە لەوەی تا پێمان دەکرێت خۆمان بەدوور بگرین لەو شوێنانەی ئەگەری بوونی ئەم جۆرە ڤایرۆسانەیان لێ دەکرێت.

ئایا ئەو ڤایرۆسانە دەناسین کە ئیفلیجکەر و کوشندەن بۆ ژیانی مەعنەوی و دڵ و ڕۆح و تەنانەت نەفسمان؟ تا چەندێك بەرامبەر ئەو ڤایرۆسانە هەستیارین کە دڵمان تاریك دەکەن و، ڕۆحمان دەپووکێننەوە؟ کاتێك جەستەمان ڕووبەڕووی نەخۆشییەك دەبێتەوە، گەر ڕێگە خۆش بکرێت بۆ ئەو بارودۆخانەی چارەسەری نەخۆشییەکە سەختتر دەکەن، بچوکترین هەڵامەت دەبێتە ئەنفلۆنزا و ئەنفلۆنزاش دەبێتە هەوکردنی سییەکان و ئەویش دواجار بەرەو مردن دەیداتە بەر، بە هەمان شێوە ئەو گوناهانەی بە بچوك دەیانبینین و، تەوبەیان لەسەر ناکەین و لەپاش ئەنجامدانیان ناچینە سەر ڕێی خاوێنبوونەوە، ڕەنگە لایەنی مەعنەویمان تێك بشکێنن و بەرەو هەڵدێرمان ببەن.

9 649750 000666
Gözümü Haramdan Nasil Korurum

نرخی ٣٥٠٠ دینارە

İRFAN
PUBLISHING